# داماوی موکریانی

**شاکر فەتاح**

(داماو) یاخود (سەید حسێن حوزنی موکریانی). وەك ئەستێرەیەکی گەش لە (سابلاخ)ەوە بەسەر شاخەکانی کوردستانی گەورەدا کشاو گەیشتە ئاسمانی شارە بەناوبانگە جوانکیلانەکەی (ڕەواندز). ئەو ناوچەیە کە گەلێك ساڵ بوو شەوەزەنگی نەخوێندەواری و بەدکاری تاریکی کردبوو، (داماو) بە بیروباوەڕە پرشنگدارەکانی و نووسراوە کوردییە نرخدارەکانیو چاپخانە خنجیلانەکەی خۆی ڕۆشنی کردەوە. بیروباوەڕی پڕو پووچ و خوارو خێچی بێگانە پەرستی لە مێشکی هەزاران کوردی (ڕەواندز) کردە دەرەوەو لە جێی ئەو بیروباوەڕی پیرۆزو بەرزی (کوردایەتی)ی دامەزراند. ئەوکاتە ساڵی ١٩٢٦ بوو. (داماو) کە لە شاری (حلب)دا بە نهێنی هاوکاری شۆڕشگێڕەکانی (کوردستانی ژووروو)ی دەکرد لە دژی (تورکە کەمالییەکان)، کە لە بەڵێنی خۆیان پەشیمان ببوونەوەو مافی کوردیان خستبوە ژێر پێوە، لە لایەن ئەوان و فەرەنسزەکانی دۆستیانەوە تەنگەتاو کرابوو، تووشی بەندیخانە کرابوو، ئازارو زیانی پێگەیەندرابوو، کاتێ کە لە بەندیخانە ڕزگاری بوو، نەوەستا دەمودەست بە خۆی و چاپخانەکەیەوە دەرباز بوو و خۆی گەیاندە (ڕەواندز). تا ساڵی ١٩٤٣ لەوێ مایەوە. پاشان لە لایەن هەندێ کەسانی خراپ و فەرمانبەرانی ناپاکەوە ئازار دراو خرایە تەنگانەوە. دەربازبوو، پەرەوازە بوو، بۆ (بەغداد) تا ساڵی ١٩٤٧یش هەر بە نووسین و چاپکردنەوە خەریکبوو، تا گیانی پاکی بە خاك سپارد.

(داماو) لە بنەماڵەیەکی خوێندەواری هەژاری شاری (سابلاخ)دا لە دایکبوو. ئەوساکە ساڵی (١٣١١)ی کۆچی بوو.



هەرکە چاوی کردەوە، نیشتمانەکەی خۆی لەژێر چنگی زۆرداریدا دی، وێرانی کردبوو. لە باوکی و نەنکی و خاڵە خوێندەوارەکانیەوە ئازارو هاوارو ئاواتی (کوردستان) تێگەیشت. بەوە گیانی (کوردایەتی)ی کرا بە بەردا. هەندێکی خوێند و لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە لە نیشتمانەکەی خۆی جیابوەوەو کەوتە دوای خوێندن و فێربوون و پیشەسازی، لەناو کوردستانی گەورەو خاکە دراوسێکانیدا. دوایی بە کامی خۆی گەیشت و بوو بە (زانایەکی نیشتمانپەروەر) و (وێژەوانێکی ڕێپیشاندەر) و (پیشەسازێکی دەست ڕەنگین) و مێژوونووسێکی هونەرمەند. ژیانێکی ساکارانەی هەژارانە ژیا، پڕ لە کولەمەرگی. جاربەجارێکیش دەحەسایەوەو دەبووژایەوە بەڵام سامانێکی گەورەی نرخداری لە نووسراوانی خۆی و کەسانی تر پێشکەشی (گەنجینەی زانست و هونەرو وێژەی کوردی) کرد. (داماو) ئەوەندەی بۆم دەرکەوتوە: (٤٧) نووسراوی کوردی داناوە. لەمە (١٧) نووسراوی چاپ کردوە. (١٠) گۆڤارو ڕۆژنامەشی دەرهێناوە. (١٢) نووسراوی کەسانی تریشی لەسەر ئەرکی خۆی چاپ کردوە. وەك مامۆستا گیوی برای دەڵێ نووسراوانی تریشی هەبوون، نەماون، لە بیر چوونەتەوە. ئەمانەو وەك بۆم دەرکەوتوە، (داماو) یارمەتیدەری کۆمەڵە شۆڕشگێڕەکانی کورد بوە. دەستی داماوو لێقەوماوانی کوردیگرتوە، چ بە پارە، چ بەکار.

داخەکەم (حوزنی) تا، ما، ژیانێکی تاڵی ڕابوارد، نرخی خۆی پێ نەدراو ڕێزی تەواوی لێ نەگیرا. بە پێچەوانەوە ئازار درا. زیانی پێ گەیەنرا، بەڵام لە هەموو دەمێکدا نمونەی زرنگی و مەردایەتی و شۆڕشگێڕی و نیشتمانپەروەری بوو. بۆ بیروباوەڕی (کوردایەتی) دەژیا، نەك بۆ خۆی.

(داماو) توانی بە ژیانی خۆی، ژیانی هەزاران کورد بگۆڕێ و ئاراستەیشی بکات بۆ سەر ڕێگای نیشتمانپەروەری. پیاوی وا شایستەی ئەوەیە (پەیکەر)ی بۆ بکرێ. (پاشماوەی نووسراوە دەستنووسەکان)ی بۆ لە چاپ بدرێ. خانوو و باخچەو نووسراوخانەو کەلوپەلەکانیشی بکرێن بە ناوازەگاهێك بۆ ئەوانەی دێنە (ڕەواندز) و (داماو) و (کورد)یان خۆشدەوێ. ئێمەیش ئەگەر ئەمەمان لە دەست بێ بۆ (حوزنی)ی بکەین، گیانی شاد دەکەین، هانی هەموو نووسەرو زاناو هونەرمەندێکی کوردیش دەدەین کە وەك ئەو خۆی بەخت بکات لە پێناو (کورد) و (کوردستان)دا.

دروود بۆ گیانی پاکی (حوزنی) کە سەری خۆی و ئێمەیشی بەرزکردەوە.

## پێگەیشتنی داماو

ناوی خۆی ( (حسێن کوڕی سەید عەبدولەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ لەتیف)ی خەزاییە. گەلێك نازناویشی بۆ خۆی بەکاردەهێنا. وەك: (حوزنی)، (خدۆك)، (داماو) (بێژەن)، بەڵام لەم دواییەدا، (داماو)ەکەی لە هەموویان زۆرتر بەکاردەهێنا.

لە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٢ی مانگی (ڕەبیعولئەوەل)ی ساڵی (١٣١١)ی کۆچیدا، لە شاری (سابلاخ)، لە گەڕەکی (حاجی حەسەن)دا لە دایك بوە.

هەر لە منداڵییەوە نیشانەی وتووریایی و زیرەکی و ژیری و گورجوگۆڵی پێوە دیاربوە. تەنیا لای باوکی و خاڵەکانی خۆی خوێندنە سەرەتاییەکانی بە فارسی و بە کوردی و بە عەرەبی خوێندوە. لە تەمەنی دوانزە ساڵییەوە لە ماڵی باوکی دوورکەوتۆتەوەو ئاوارە بوە. بەناو گەلێك شارو دێهاتی کوردستانی گەورەو خاکانی تردا گەڕاوە. لەهەر شوێنە شتێك فێربوە، لە زۆر کاتیشدا خۆی خۆی فێرکردوە. تا وای لێهاتبوو، لەم دواییەدا، بە تەواوەتی لە زانستەکانی ئاین و مێژوو وێژەی کوردی و فارسی و عەرەبی تورکیدا قاڵ ببوو. هەروەها لە زمانەکانی ڕووسی و فەرەنسیشدا شارەزا ببوو. بێجگە لەوە فێری گەلێك پیشەسازی بە نرخیش ببوو، وەك: (چاپگەری) و (مۆرهەڵکەندن) و (خۆشنووسی) و (نووسین لەسەر مس و زەردو شووشەو بەردی نرخدارو دار) و (مۆری لاستیك) و (زەنگۆگراف) و (وێنەگەری) و (کلێشە هەڵکەندن).

ئەرك و ئازاری ئاوارەییو ناخۆشی ژیان و گوزەرانی ناو کوردستان، بە هۆی زۆرداری داگیرکەران و زۆرو ستەمی ناو کوردەواریەکە خۆیەوە، (داماو)ی تەواو پێگەیاندبوو. کە لە ساڵی ١٩٣٤دا دیم، (داماو) پیاوێکی زرنگ و مەندو نەرمونیان و تێگەیشتوو و ژیرم هاتە پێشچاو. دڵی پڕ ببوو لە خەم و خەفەت بۆ نەتەوەو نیشتمانەکەی خۆی، دڵی پڕببوو لە گلاراوی بۆ کەساسی و ڕەنجەڕۆیی خۆی بە دەست ناشێتی و بەدخویی هەندێك لە هاونیشتمانەکانی خۆیەوە. هەندێ جاریش ڕۆژگار لایەکی لێ دەکردەوە، لە دەستکورتی و نوشوستی و بەندیخانەو ئاوارە کردن ڕزگاری دەبوو، پشوویەکی دەداو دەحەسایەوە، بەڵام هەرگیز نیشتمان و نەتەوەکەی خۆی لە بیر نەدەچووەوە. بەو پارانەی دەستی دەکەوتن و بەو نازو جیازەی دەهاتە بەردەمی، بەکەڵکی کوردە لێقەوماو و بێچارە و هەژارەکان دەهات، وەك لە (سووریە) و (لوبنان) دا کردی. هەموو دەمێکیش تا دەستی ڕۆیشتبێ بە نهێنی فرمانی گرنگ گرنگی دەبینی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانی کوردستاندا. لە (حەلەب) و (ڕەواندز) و (هەولێر) و (سلێمانی) و (بەغداد)یشدا، بێوچان خەریکی نووسین و چاپکردن و بڵاوکردنەوەی نوسراوانی کوردی بوو.

## ڕەوشت و سروشتی داماو

(داماو) ئۆقرەی بە خۆی نەدەگرت. پیاوێکی ڕەهەندە بوو. بە دوای زانیاری و کۆکردنەوەی نووسراوانی کوردی و ئەو نووسراوانەدا دەگەڕا کە لە (کورد) و (کوردستان) دەدوان.

بێجگە لە کوردستان بە خاکی (ڕووسیا) و (تورکیا) و (ئێران) و (ئەفغان) و (سووریە) و (لوبنان) و (میصر) و (حیجاز) و (فەرەنسە)یشدا گەڕاو گەشتی کرد. وەك هەنگ کە لە هەر گوڵە مژێك دەکات و لەو گوڵ ئاوانە هەنگوین دروست دەکات. (داماو)یش لە هەر خاکە هونەرێك و بەهرەیەك فێر دەبوو، زانستێکی وەدەست خۆی دەخست. پاشان کە هاتەوە کوردستان ئەو هەموو کۆمەڵە زانست و هونەرو وێژانەی لە شێوەی وتار و نووسراوو گۆڤار و ڕۆژنامەدا. وەك چەپکە گوڵێك پێشکەشی کوردەواری کرد.

(داماو) پیاوێکی کەڵەگەتی چوارشانەی قژزەردی خورمایی دەموچاو سوورو سپی بوو. ڕیشێکی تۆپی پێوە بوو. لە چاوە گەشە جوانەکانیەوە پرشنگی زانین و شارەزایی دەهاتە دەرەوە. ڕووخۆش بوو، قسە شیرین بوو، هەرگیز پیاو لە هاودەمی تێری نەدەخوارد. کانێك بوو بۆ شارەزایی و هونەرمەندی و ڕەوشت و خوی بڵند. دڵفراوان بوو. دەستبڵاو بوو. دڵتەڕو دەستڕەنگین بوو. لەهەر کوڕێکدا بتدیایە کەڵکی لێ وەردەگیرا. ئەو هەستە نیشتمانپەروەرییەی ئەمەندە کڵپەدارو بەتین بوو، لە ماوەی چەند

سالێکدا توانی ناوچەی ڕەواندز لە بێگانەپەرستییەوە وەربگێڕێ بۆ کوردپەرستی. (داماو) هەموو ئامانجێکی ژیانی: (پێشخستنی کورد) و (داواکردنەوەی کوردستان) بوو. جا بەو زۆرزانی و شارەزاییەوە کە هەیبوو لە کاروباری ژیاندا توانی گەلێك پیاوی گەورە گەورە و ناودار، چ لە ناو کوردەواریدا، چ لەناو بێگانەکاندا بکات بە دۆستی خۆی، هەر بۆ ئەو ئامانجەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو دۆستایەتییەی ناوەند خۆی و ئەوان بەکاربهێنێ بۆ کەڵکی کوردەواری. لەمەیشدا زۆر سەرکەوت.

(داماو) پیاوێکی بە ئارام بوو. بەرگەی کارەساتی ناخۆشی جیهانی بە سنگێکی فراوانەوە دەگرت. جا چونکە سەربڵندو خاوەن ئاین بوو، لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا ساکارو هەژارانە گوزەرانی دەکرد، بەڵام لە بەرامبەر ئەرك و ئازاردا، کۆڵی نەدەدا ورەی بەر نەدەدا، تا نەگەیشتایەتە ئامانجەکانی خۆیشی وازی نەدەهێنا.

### گەرو گیچەڵ لە کۆڵی نەدەبووەوە!

(داماو) بلیمەتیك بوو بۆ خۆی. بە هەموو هێزو تەوژمیکەوە خەباتی دەکرد. ئەو لەگەڵ ئەمەیشدا کە بە تەنگ خۆشگوزەرانی خۆیەوە نەبوو. ژیانیکی کولەمەرگی دەژیاو پییشیەوە ئارامی گرتبوو، بەڵام لە سەریکەوە دوژمنانی کورد لەسەر ئەو خەباتانەی کە دەیکرد، گەریان پیدەکردو تووشی مەینەتییان دەکرد. لە سەریکی تریشەوە ئەوانەی بە بەرزبوونەوەو ریزگرتن لەوەوە، چاویان بەرایی نەدەدا بیبینن، هەموو جۆرە تەلەکەبازیەکیان لەگەلدا دەکرد و تووشی سەرگەردانییان دەکرد. جاری وایش هەبوو هەردوو جۆرە دوژمنەکانی لە دژی ئەو یەکیان دەگرت و تووشی بەندیخانەو ئاوارە کردن و هەژاری و ئازارو ریسواییان دەکرد. هەندێ جار فەرماندارەکانی (ئیران) و (تورکیا) و (عیراق) و (سوریە) و دەسەڵاتدارەکانی (فەرەنسزە) و (ئینگلیز) و نۆکەرەکانیان لە فەرمانبەران و مەلاکان و سەرەك هۆزەکان، لە پی شوینی سەری دەگەران، هەریەکەیان لە شوینیکداو لە شیوەیەکداو لە تافیکدا ئازاری دەداو زیانی پیدەبەخشی. (داماو) جاروبار ئەو تەنگ و چەلەمانەی خۆی بە دلیکی پر لە ئاگرەوە دەگیرایەوە. دلی پیاوی دەسووتاند. وەك چەرە دووکەل هەناسەیەکی ساردو رەنجەرۆیی لە دل و دەروون و دەمی دەهاتە دەرەوە. کەچی ئەوەندەی پێ نەدەچوو، دەستی دەدایەوە خەباتە بەنرخەکانی خۆی، وەك: (دانانی نووسراو) و (گۆرینی نوسراو بە زمانی کوردی) و (چاپکردنی گۆڤارو رۆژنامەو نووسراوان بە زمانی کوردی) و (بلاوکردنەوە)یان بە کوردستان و هەموو جیهاندا، لەگەڵ (یاریدەدانی هەموو خەباتیکی شۆرشگیرانە لە کوردستاندا). هەر بەو خەباتانەیش خۆی لەبیر دەچووەوە!

هەندێ لە مەلاکانی رەواندزیش کە ئەوپەری ئازاریان دەدا، (داماو) لەم شیوەیەدا داخی دلی خۆی بەرامبەر شارەکەیان دەردەبرێ:

"خراپیکی کە تۆ لە منی دەبینی
دوو پیتە پیت بلیم با دانەمینی
یەکێ کوردم، دوەم راستەوتارم
لەوەوم زیاتر نیە سووچی نهینی
لەوێ رۆژێوە بەدبەخت و کەنەفتم
کە هاتمە شاریکی وا؛ مەرگە ژینی
گرفتاری خەم و دەردیکی وا بووم
نیە رزگاری تۆ مەرگم ببینی
لە دەست (کوردان) برا ژینم بەلایە
خۆراکم تالە، کارم دل برینی
خەم و دەردو بەڵاو گیچەل و شەر
بەریژەن دێ بە سەرما دەم کەوینی
وەها (داماو)ی دەستی جەهلی کوردم
کەنەفتی و ناهومیدیم کەس نەبینی"

* * *

هەروەها (داماو) دادی بوو لە دەست کاربەدەستە نەزانەکان، دەیگوت:

"ئەگەر رووت و نەدارو بێ کەوابم
وەگەر برسی و گرفتاری هەوابم
لە خویش و نیشتمان ئاوارە مابم
لە دەست یارو نەیارا سەر شیوابم
لەژیر جەورو جەفاو توهمەت رزابم
لەنیو تاریکی کونجی غەم خزابم
وەکو (مەم) بەندی زنجیری بەلابم
وەکو (بیژەن) لە چالاوی قولا بم
ئەسیری زولم و ئیستبدادی وابم
لە خاکی خۆم غەریب و بێ نەوا بم
لەنیو بیگانە داماوی قەزابم
بە خزم و کەس و باب و برابم
ئەوەم پێ چاترە، نەك سەر نەوی کەم
لە پیش گەورەی نەزان گەردن کەچی کەم!"

کەچی لە سالی ١٩٥٣دا، بەرامبەر بە وینەیەکی خۆی گوتوویەتی:

"وینـــــــەی وقـــــــار وەعـــــــزم و ســـــــەباتم
راوەســــــــتە هـــــــــەتا هـــــــاتی ولاتم!"

لەو وینەیەدا (حسین حوزنی موکریانی)، کە لـە نووسـراوی (وینەگەری و کۆلین)دا چاپی کردوە، بە جلوبەرگیکی کوردییەوە، لە شیوەیەکی شەنگوشۆخدا، گۆچانەکەی گرتوە بە دەسـتەوەو، رەپ راوەسـتاوە، رووی کردۆتـە ئاسـۆ، چـاوەروانی دوارۆژیکـی پرشنگدار دەکات بۆ (کورد) و (کوردستان).

**شاکارەکانی داماو**

ئەو نوسـراوانەی (سـەید حسـین حوزنـی) یـاخود (دامـاو) دایناون و لە چاپی داون ئەمانەن:

١-غونچەی بەهارستان.

٢-پیشەوای ئایین.

٣-دیریکی پیشکەوتن. میژووی دوو بنەمالەی کوردە کە لـە ئاوربایەگان و دیاربەکردا فەرمانرەوا بوون.

٤-میـژووی دەوری ئـەمارەت لـە کوردسـتان سـالی ٢٥ هــ-٦٥٦هـ.

٥-ئـاوریکی پاشــەوە حکومــەتی بــەرزەکانی لــە حلــوان و دینەوەر.

٦- میژووی حوکمدارانی کورد لە هەولیر.

٧- = پادشای چەند بنەمالەیەکی کورد.

٨- = حوکمدارانی بابان.

٩-خۆشی و ترشی (بزنۆکەو مەرۆکە).

١٠-ناودارانی کورد لە (١٢٠٠هـ) هەتا (١٣٠٠) هـ.

١١-میژووی شاهەنشاهانی کوردی زەند لە خاکی ئیراندا.

١٢-میژووی کوردو نادرشا.

١٣-وینەگەری و کۆلین (زەنگوگراف).

١٤-بە کورتی میژووی (میرانی سۆران).

١٥-میژووی کوردستانی موکریان/ ١

١٦-گەوهـــــەری یەکانـــە (بەشــــیکی بچکۆلــــەی لــــە حەلەب چاپ کراوە).

١٧-میرگەی دلان (میژوە لە حەلەب چاپ کراوە).

١٨-دەستەگولی بویژان (لە رەواندز چاپ کراوە).

١٩-بە کورتی هەلکەوتی دیریکی میژوویی لە بەغدا لە سالی ١٩٤٧دا چاپ کراوە..).

* * *

ئەم نووسرانەیش، هـی کەسـانی تـرن، بـەلام (دامـاو) لەسـەر ئەرکی خۆی چاپی کردوون:

١-مەم و زین- ئەحمەدی خانی.

٢-عەقیدا ئیمانی- شیخ عەبدوللا نەهری.

٣-دیوانی ئەدەب- میصباح ئەلدیوان.

٤-دیاری مەلا محەمەدی کۆیی.

٥-کەلەباب- عیسا.

٦-دیاری بۆ چووکا کوردان- فەهمی زرگلی.

٧-ترازن- سەید تەها شەمزینی.

٨-باوەری ئاین- شیخ سەمیعی بانەیی.

٩-ئەحمەدی- شیخ مەعروفی نۆدییی.

١٠-سەماو زەمین.

١١-شیرین و فەرهاد.

١٢-مەسئەلەی کوردەکان- عەبدولقادر حیشمەت.

١٣-دەستووری خوو بۆ کچ و کور- چەند خویندەواریك.

* * *

ئـەو نووسـراوانەش کـە (سـەید حسـین حوزنـی) داینـاون و هیشتا چاپ نەکراون ئەمانەن.

١-ناودارانی کورد/ ١

٢-میژووی بارامی چۆبین.

٣-میژووی کوردستان/ ١ و ٢ و ٣.

٤-میژووی سلیمانی و شاعیرەکانی.

٥-رووناکی دەری دل و دەروون.

٦-جوگرافیـــــای دیریکـــــی کوردســـــتان (موکریـــــان ئەردەلان و لورستان).

٧-ددانساز.

٨-میژووی دزەی یان.

٩-میژووی کۆیە.

١٠-میژووی سمکۆ و تەهای شەمزینی.

١١-میژووی هەولیر.

١٢-میـــژووی کوردســـتانی بـــاکووری و بەهەشـــتی شـــیخ عەبدولقادر و شیخ سەعیدی شەهید.

١٣-میژووی کەرکووك.

١٤-میـــژووی ئومــــەرایانی کــــوردی عــــیراق لــــە (١٢٠٠) هەتا (١٢٢٥)هـ.

١٥-میژووی ئامیدی و بادینان و یەزیدی و بابان.

١٦-میژووی کوردو صەفەوی.

١٦-میژووی ئیعلانی سەفەربەر و ئیستبدادی تورك و بیگانان لە کوردستاندا.

١٨-میژووی دوو سالەی کوردستانی جنوبی لە پەرتووکی (ا. ج. ولسن) وەرگیراوە.

١٩-سابلاخ و هیزو توانای شیخ عەبدوللای نەهری.

٢٠-میـژووی ئەفسـەری شـاهان (میـژووی بنەمالـەی سـولتان سەلاحەدینی ئەیوبی)یە.

٢١-میژووی میللەتی کورد.

٢٢-میژووی رزگاری لە نەزانین (کۆمەلایەتی)یە.

٢٣-میژووی ئاوینەی بالانوین (میژووی شارەزوور و ناودارەکانیان).

٢٤-میژووی پەردەی سینەمای ئاین.

٢٥-میژووی بارزان، مەلا مستەفای بارزانی.

٢٦-میژووی ئاسورییان و شەری بارزان و عیراق.

٢٧-میژووی ئیران لە ئەردەشیری پاپەکانەوە تا رەزا شای پەهلەوی.

٢٨-میژووی خەوانینی هەورامان و مەریوان.

٢٩-میژووی رەواندز.

٣٠-میژووی پادشایانی ئەیوبیان و هەزبانیان.

٣١-میژووی جاف و دزەیی و خۆشناو.

### رۆژنامەو گۆڤارەکانی داماو

١-گۆڤاری کوردستان:

ئەم گۆڤارەی لە ئەستەمبوولدا لەگەڵ (محەمەد مەهری)دا دەرهیناوە. (٣٧) ژمارەی لی دەرچوە. زرنگ کاری (سیاسی) و کۆمەلایەتی و ویژەیی و زانستی بوە. حەفتەی جاریك دەرچوە. بە زمانی تورکی و کوردی بوە. لە سالی ١٩١٧دا دەستی پیکراوە. لە سالی ١٩١٨دا داخراوە.

٢-گۆڤاری ئارارات.

٣-گۆڤاری "کوردستان"

٤-گۆڤاری "بۆتان"

٥-گۆڤاری "چیا کرمانج"

٦-گۆڤاری دیاربەکر

٧-گۆڤاری سۆران.

ئەمانە لە شاری (حەلەب)دا دەردەهینران، بە نهینی لە دژی تورکەکان و فەرەنسیزەکان، کە ئەودەمە دژی شۆرشی شیخ سەعید وەستابوون. لە هەرکەیان چەند ژمارەیەك دەرچوو پییان زانرا. داخران، وا دیارە لە سالی ١٩٢٥دا دەرهینرابن.

٨-گۆڤاری زاری کرمانجی:

لە سالی ١٩٢٦دا لە رەواندز دەری دەهینا. تا سالی ١٩٣٢ ما. (٢٤) ژمارەی لی دەرچوو.

٩-رۆژنامەی ژیان:

ئەم رۆژنامەیە هی (پیرەمیرد) بوو. لەسەر خواستی خۆی (سەید حسین حوزنی) لە سالی ١٩٣٤دا هاتە سلیمانی، دەستی کرد بە یارمەتیدانی. تا گەشەی پی دا. لە (٩٣٤/٧/٢٣)ەوە هەتا ١٩٣٤/١١/١٥ پیکەوە بوون. پاشان (داماو) بە دلشکاوییەوە لیی جیابوەوەو لە سلیمانیەوە چوەوە رەواندز.

١٠-گۆڤاری رووناکی:

گۆڤاریکی ویژەیی و میژوویی و کۆمەلایەتی بوو. لە هەولیردا مانگی جاریك دەردەچوو. لە ناوەند سالەکانی ١٩٣٥ و ١٩٣٦دا ژیا (١١) ژمارەی لی دەرچوو. (شیت مستەفا) هەر بەناو خاوەنی گۆڤارەکە بوو. ئەرکەکە، هەمووی بەسەر شانی (سەید حسین حوزنی)یەوە بوو.

١١-دەنگی گیتی تازە:

گۆڤاریکی زرنگ کاری و میژوویی و ویژەیی بوو. لە (بەغداد) لە ناوەند سالەکانی ١٩٤٣ و ١٩٤٥دا (٢٤) ژمارەی لی دەرچوو. هەر مانگی جاریك دەردەچوو. دوایی کە بوو بە هەفتەیی لە ناوەند سالەکانی ١٩٤٥ و، ١٩٤٦دا (٣٦) ژمارەی تری لی دەرچوو. ئنجا بوو بە رۆژنامەیەکی هەفتەیی. لە ناوەند سالەکانی ١٩٤٦ و ١٩٤٧دا (٣٤) ژمارەی تری لی دەرچوو. بالویزخانەی بەریتانیا ئەرکی دەرهینانی ئەم گۆڤارەی خستبوە سەر ئەستۆی خۆی، بەلام لەژیر سەرپەرشتی (داماو)دا بوو. (مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ)یش یارمەتی دەدا.

* * *

لە راستیدا شاکارەکانی (داماو)، هەر ئەمەندە نەبوون. گەلیك شاکاری نهینیشی لە دەست وەشابوەوە، بەلام زانیارییەکی تەواوم لەم روەوە دەست نەکەوت. بۆیەکا جاریٚ بەمەندە وازم هینا.

### کەسایەتی داماو

ئەوەندە هەیە لەناو شاکارەکانی (حوزنی)دا:

(پیگەیاندنی خۆی) و (دامەزراندنی چاپخانەکەی) لە (حەلەب) و (رەواندز)دا، لە هەموویان گرنگترن. چونکە (حوزنی) بە هۆی ئەو دوو شتەوە توانی بیروباوەری کوردەواری بگۆری و بیخاتە سەر ئەوەی کە هەرچەندیٚ مرۆڤ هەژارو بیدەسەلات و بیکەس و ئاوارەبیٚ، لە توانایدا هەیە چارەنووس و ژیانی خۆی سەرتاپا بگۆری و بیشیگەیەنیتە پۆپەی هەرە بەرزی مرۆڤایەتی و نیشتمانپەروەری و سەربلندی. لە راستیدا (حوزنی) هەرچەندە هەندیٚ هەلەی دەکرد، هەرچەندە خۆی هەموو دەمی لە بەخت و چارەنووسی خۆی بە گلەیی بوو، بەلام بە پیاویکی گەورەو بە نیشتمانپەروەریکی چاك و پاك و کارگوزارو، بە زاناو ویژەوانیکی بەنرخ دادەنریٚ. کە پیویستە نەك هەر خۆی بە خۆیەوە گیانی کامەران بیٚ، بەلکو نەتەوەی کوردیش پییەوە سەربەرزو کامەران بیٚ.

### ئایا راستە داماو ناپاك و دز بوو؟!

کەچی داخەکەم لە لایەن دوژمنانی کوردو دوژمنانی خۆیەوە گەلیك بەندو باوی بۆ ریکخرا. گەلیك توانج و پلاری تیگیرا گەلیك داویشی بۆ نرایەوە. کە لە ئەنجامی ئەو شتانەدا زۆر ئازارو زیان و سەرگەردانی و بەندیخانەو ئاوارەیی و هەژاری و دەردەداریی

چیشت. پییان دەگوت: ناپاکەو بۆ کەلکی ئینگلیزەکان دەجوولیتەوە. پییان دەگوت: خۆفرۆشەو بۆ کەلکی ناپوختەی خۆی کەلکی گشتی دەخاتە ژیرپییەوە. پییان دەگوت: بە لیشاو پارە لە ئینگلیز وەردەگری و نۆکەریکە لە نۆکەرە گرنگەکانی ئینگلیز!

جاریکیان هەندی لە مەلاکانی رەواندز بریاری خوانەناسی و کوشتنیان دا. جاریکیان مەر سەربریکیان لی هاندا تیروپر جنیوو قسەی ناشیرینی پیگوت. جاریکیشیان کردیان بە دزو توندیان کرد لە بەندیخانەو دایشیان بە دادگاو دووریشیان خستەوە لە رەواندز!.. تا ماوەیەك (سەید تەها)ی سەرداری رەواندز دەیپاراست، بەلام داخەکەم زۆری پی نەچوو، لە دەستی چوو.

ئینگلیزەکان لەو سەردەمەدا دەسەلاتیان زۆربوو بەسەر عیراقدا. بە لیشاویش پارەیان دەدا بە پیاوەکانی خۆیان. جا ئەگەر (حوزنی) پیاوی ئەوان بوایە، بۆچ لەم هەموو سالانەدا بە هەژاری و دەستکورتی و نابووتییەوە دەژیا؟.. یاخود چۆن فەرمانبەرانی عیراق دەیان ویرا بەو جۆرە تەنگەتاو و ریسواو سەرگەردانی بکەن؟!. پیاویك ئەگەر خەریکی کارو فرمانی داگیرکەرانی ئینگلیز بی، بۆچ خۆی بە نووسین و چاپکردن و بلاوکردنەوەی نووسراوانەوە خەریك دەکات، کە تا ئیستاکەیش هیچ نووسەریك، بەو بابەتانەوە، ژیان و گوزەرانی بۆ بەریوە ناچی؟!

لە سەریکی تریشەوە ئەگەر (حوزنی) بۆ کەلکی تایبەتی خۆی بگەرایەو بە تەنگ چاکەی خۆیەوە بوایە، دەیتوانی زۆر بە ئاسانی ببیتە فەرمانبەریکی شایستەی خۆی، کە بتوانی بە مووچەیەکی شایستەوە، خۆی و خیزانەکەی لەوپەری خۆشگوزەرانیدا بژی. چونکە ئەو سەردەمە خویندەوارو تیگەیتشوو و جیهاندیدەیی وەك ئەو کەم هەبوو. فەرمانرەوایی عیراق خواخوای بوو، یەکیکی وەك ئەو ببی بە فەرمانبەر، تا کەلکی لی ببینی. ئەو لە سالی ١٩٢٦دا گەیشتە رەواندز. گەلیك پیاوی گەورەی دەناسی، لەناو کورد و لەناو بیگانەدا، کە دەیانتوانی بۆی تیبکۆشن و دایبمەزرینن لە دەزگایەکی نایابی میریدا، بەلام (حوزنی) خۆی لە فەرمانبەری نەگەیاند. چونکە ئاواتی هەرە نازداری ئەو ئەوە بوو کە لە ریگای نووسراو دانان و نووسراو چاپکردن و نووسراو بلاوکردنەوە، هەروەها لە ریگای وتاردانەوە، لەناو کۆرە نەتەوەییەکاندا، کوردەوارییەکەی لە خەو راپەرینی و زیندووی بکاتەوەو، بیریی‌شی رۆشن بکاتەوەو ریگای سەربەستی و کامەرانی و سەربەرزیشی پیشان بدات، تا رووبکاتە پیشکەوتن و ئەویش وەك هەموو گەلیك بە سەربەرزییەوە بژی. بە واتایەکی تر (حوزنی) بۆ بیروباوەرەکانی دەژیا، بۆ خۆی نەدەژیا. گویی نەدەدایە پیویستییەکانی کامەرانی و خۆشگوزەرانی خۆی، گویی دەدایە ئامانجە گشتییەکانی خۆی کە بریتی بوون لە رزگاربوونی

کورد لە دەست هەژاری و نەخویندەواری و نەخۆشی و ژیردەستی.

جا پیاویك: ئەمانە ئاوات و ئامانجی بووبن و ئەمانە ریگای خەباتی بووبن، دەشی ببی بە پیاوی ئینگلیز یاخود داگیرکەرانی نیشتمانەکەی خۆی؟!

لە راستیدا (حوزنی) وەك هەموو رۆشنبیریکی شۆرشگیر، بە ئاشکراو بە نهینی تیدەکۆشا بۆ ئەوەی دۆست پەیدا بکات بۆ نەتەوەکەی خۆی، لە گەورەپیاوانی خۆ و بیگانە، تا لە کاتی پیویستا بۆ کەلك و چاکەی نیشتمانەکەی خۆی، ئەو دۆستایەتییەیان بەکاربهینی. لەناو ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمەیشدا هەندی دۆستی پەیدا کردبوو، وەك (ئەدمۆندس) کە ئەوساکە راویژکاری کاربەدەستی ناوەوە، واتا (مستەشاری وەزارەتی داخلیە) بوو. ئەمانە کە دەهاتنە رەواندز (حوزنی)یان وەك پیاویکی کوردی زاناو رۆشنبیر دەهاتە پیشچاو. دەهاتنە سەردانی چاپخانەکەی و باخچە جوانەکەی لە رەواندزداو دەبوون بە ئاشنای. لە شارەزاییەکەی لە ویژەو میژوو و کۆمەلایەتی کوردا، کەلکیان وەردەگرت، جا (داماو) کە فەرمانبەرەکانی عیراق تەنگە تاویان دەکرد، بە ناچاری پەنای دەبردە بەر ئەو دۆستە ئینگلیزانەی تا رزگاری بکەن. ئەوانیش لە سنووری دەسترۆیشتنی خۆیان و یاسادا یارمەتییان دەدا. چونکە خۆیشیان لە فەرماندارانی عیراق بوون!

(حوزنی) لەناو رووسەکانیشدا گەلیك رۆژهەلات ناسی گەورە گەورەی دەناسی و نامەکاریشی لەگەلدا دەکردن. وەك: (ف. مینۆریسکی) و (ب. نیکیتین). هەروەها رۆژهەلاتناسیکی ئەلمانیشی دەناسی. ناوی (کارل هەدەنگ) بوو. نامەکاریی لەگەلدا دەکرد. لەناو کوردەکانیشدا (جەلادەت بەدرخان، کامەران بەدرخان، فەرەج الله زەکی کوردی، محەمەد ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، رەفیق حیلمی، مەلا گچکەی هەولیر، مەلا محەمەدی کۆیە، شیخ مەحمودی مەزن، شیخ ئەحمەدی بارزانی، مەلا مستەفای بارزانی، سەید تەهای شەمزینانی، قازی محەمەدی سابلاخ)، کە هەموویان پیاوی کەلە کەلەو رۆشنبیر بوون، داماویان خۆشدەویست و ریزیان لی دەگرت و ئەگەر کاریکیشی بکەوتایە لایان یارمەتیان دەدا.

بیجگە لەمە من وام دیتە پیشچاو کە (داماو) تیکەلی لەگەل زوربەی بزوتنەوە نهینییەکانی کوردا هەبوو. دوور نیە کە ئەندامیش بووبی لەناو هەندی لەو کۆمەلە نهینییانەدا. جا پیاویکی وەك ئەو ئەگەر پەیوەندی لەگەل گەورەپیاوان و دەسەلاتدارانی کورد و بیگانەدا پەیدا نەکات، چۆن کارو فزمانە گشتییەکانی خۆی و کۆمەلەکانی خۆی پیجیبەجی دەکری؟!

جا لە پیش شەری یەکەمی جیهانی و لە پاش شەرەکەیشدا هەتا ئەم چەند سالەی دواییە، رۆشنبیرەکانمان لەو باوەرەدا بوون

که له توانایدا هەیه کەلك له فەرمانرەواییه بیگانەکان وەربگیرێ بۆ کاروباره گشتییەکانی کوردو کوردستان. لەبەر ئەمه نەك (حوزنی)، زوربەی رۆشنبیرەکانی تریش تیکەلییان لەگەڵ ئینگلیزەکان و فەرەنسیەکان و رووسەکان و ئەمەریکاییەکاندا دەکرد بۆ مەبەستی گشتی کوردەواری.

جا لەبەر ئەم هۆیانه، هەموویان، من لەو باوەرەدام که "داماو" هەر تیکەلییەکی لەگەڵ ئینگلیز یاخود بیگانەکاندا کردبێ، به نیازی پاك بوه، نەك خراپ. واتا بۆ کەلکی کوردەواری بوه. نەك بۆ کەلکی ناپوختەی خۆی!.. ژیانه پر ئەرك و ئازارو هاوارەکەی و بەرهەمه گەورەو گرنگەکانیشی بەلگەن بۆ ئەوەی که (حوزنی) یەکیك بوه له نیشتمانپەروەره گەورەکانی کورد، که بلیمەتییەکەی خۆی و ویژەوانی و زاناییەکەی خۆی، تا ما، بۆ کەلکی کوردەواری و کوردستان تەرخان کرد.

جا پیاویك کەوابێ، دووره لەوەی که دز بێ یاخود ناپاك. تا ئیستاش بەلگەیەکم دەست نەکەوتوه که ئەو تاوانانەی خستبوویانه پالی راست دەربچن.

* * *

## مردنی حوزنی

(حوزنی) لەتاو تەنگەتاوکردنی دوژمنەکانی کوردو خۆی نەیتوانی له رەواندزدا بمینیتەوه. چونکه داویان بۆ نایەوەو به دزیتی سێ کەللە شەکرو دوو گوریس و سێ باتمان خورییەوه بەدناویان کردو خستیانه بەندیخانەوه!

له بەردەم دادگایشدا بریاری بەسەردا درا! لەمەدا هەندێ له مەلاکانی رەواندز به نارەوا له رووی دادگادا تاوانەکەیان خسته ئەستۆی. کەچی له پاش برانەوەی چەندوچوون کردنی دادگا به ماوەیەك، هەر ئەو مەلایانه خۆیان هاتنه لای بۆ مالەوەو پەشیمان بوونەوەو داوای چاوپۆشی و لیخۆشبوونیشیان لیکرد.. گوتیان: (بمان بەخشه به زۆر پیمان کرا!؟) _(حوزنی)یش لەسەر ئەو کەتن و ریسواییه، دلی له رەواندز هەلکەندراو لەسەر ئامۆژگاریی دۆستەکانی گواستییەوه بۆ بەغدا. ئەوکاته ١٩٤٣/١١/١٨ بوو. ئەم کارەساته کاریکی زۆری له (حوزنی) کرد. بەسەزمانه. هەموو دەم لیکی دەدایەوەو خەفەتی پیدەخوارد. هەستی به سپلەیی و دلرەقی و ناهەمواری کۆمەلایەتیه رزیوەکەمان دەکرد. هەر به جاریك ژیان و جیهانی لەبەرچاو کەوت. دوایی ئەمه کاری کرده سەر تەندروستی لەش و هۆشیو له ١٩٤٧/٩/٢٠دا له شەودا کوتوپر کەوت به دەماو مرد.

لەسەر مردنی (حوزنی) گەلیك مقۆمقۆ کرا. هەندیك دەیانگوت: ژنەکەی دەرمان خواردی کردوه به پەنجەی ئینگلیزەکان. هەندیکیش دەیانگوت له داخانا مردوه. ئەمەیش بۆ ئیمه به تەواوەتی راستی دەرنەکەوتوه، بەلام راستییەکەی هەرچۆنیك بێ، نەتەوەی کورد به مردنی (سەید حسین حوزنی) زانایەکی گەورەو نیشتمانپەروەریکی سەربلندو ویژەوانیکی خاوەن بەرهەمی گەورەی له دەستچوو، که پیویسته لەسەر هەموومان چاکەکانی بدەینەوه. بام له دوای مردنیشی بێ تا گیانی شادبکەین. ئەویش بەم جۆره که کاربەدەستانی کورد بخەینه سەر ئەوەی (پەیکەر)یك بۆ (حوزنی) دروست بکرێو لەسەر چەقی ریگای شاری (رەواندن)دا دابنرێ -بەمەرجی شیوەی کۆمەله نووسراویکی گەورەو چاپخانەیەکیش له پەیکەرەکەدا دیاربێ.

هەروەها پیویسه نووسراوه چاپنەکراوەکانیشی چاپ بکەین. بیجگه لەمه خانوەکەی (حوزنی) -ئەگەر مابێ- بپاریزێ و هەر نووسراو و کەلوپەلیکیش لی بەجی ماوه، لەو خانوەدا دابنرێ بۆ ئەمەی هەر دۆستیکی کوردو خویندەوارێ رووی کرده شاری (رەواندن) سەریك له خانوەکەی حوزنی و نووسراوەکانی و کەلوپەلەکانی بدات و چاوی خۆی پێ رۆشن بکاتەوه تا هەر هیچ نەبێ داماو که له هەموو ژیانی خۆیدا خۆشییەکی وای نەدی، له پاش مردنی گیانی بەم ریزگرتن و کار پەسەندکردنەمان شاد ببێ.

(داماو) که گیانی پاکی به خاك سپارد، هەر ژنیکی لی بەجی ما. بەسەزمانه منالی نەبوو جیی بگریتەوه. دەیگوت: "منالەکانم نووسراوه کوردییەکانمه. بەوان چاوی خۆم رۆشن دەکەمەوه".

برایەکیشی له پاش بەجی ماوه، ناوی (مامۆستا گیو)ه.. که ئەمیش چەشنی کاکی هەر لەسەر ئەو ریگایه دەروات که ئەو پیارۆیی بوو. بیجگه لەوه برایەکی یەجگار دلسۆزی بوه. له تەنگانەو خۆشیدا لەگەلیا بوو. ئیستاکەیش شەوو رۆژ یادی دەکات. هەر به چەشنی ئەویش راژەی گرنگ گرنگ پیشکەشی نەتەوەکی خۆی دەکات. بیگومان (مامۆستا گیو)یش که چەشنی خوالیخۆشبووی کاکی خەبات دەکات، شایستەی هەموو ریزگرتن و یارمەتی و خۆشەویستییەکی هەموومانه. له دانانی ئەم نووسراوەدا. بەشی هەره گەورەی زانیاریم لەو وەرگرت. لەبەرئەوه پر به دل سوپاسی دەکەم و له خوام دەوی لەم کۆششه پیرۆزو بەرزەیدا که به دریژایی تەمەنی خۆی خەریکیەتی سەرکەوێ و به خۆشی و کامەرانییەوه بژی.

دروود بۆ گیانی پاکی (داماو) و خۆشی له کەسوکاره بەریزەکانی و نەتەوەی کوردیش که پیاوی وایان تیا هەلکەوتوه.

**سلیمانی ١٩٧٢/١/٦**
**شاکر فەتاح**
**(خاوەنی پرۆژەی خویندەواری کورد)**

**سەرچاوه:** داماوی موکریانی، شاکر فەتاح، چاپی یەکەم، ١٩٧٢.

# چوونە هەولێرم و مەتبەعە دامەزراندنم* و جەریدەی ڕووناکی دەرخستنم لە هەولێر

لە ڕەواندزدا گۆشەی تەنهاییم گرتبوو، لە ماڵی خۆم دانیشتبووم، لەگەڵ تەماشاکردنی کتێب و تەئلیفات خەریکبووم، دەستی بێ تەماییم لەسەر دڵی قەناعەت و سەبات دانابوو، چاوم لە دەرگای خودا بڕیبوو، چونکە ساڵی پێشتر (١٩٣٤ ك. م) لە حوزەیرانەوە هەتا کانون لە سلێمانی خەریکی لابردنی توهمەت و بەڵاو دامەزراندنی مەتبەعەی بەلەدیەو دەرهێنانی ڕۆژنامەی (ژیان)ی کوردی بووم. ڕووت پەرێشان گەڕابوومەوە ڕەواندزو زستانی ساردم بە ئاهوناڵەوە ڕابوارد، هەناسەساردو بێدەستەڵات کەوتبوومەوە، چاوەنواڕی دەردی بێسامانێکی دیکەم دەکرد، کە دەستی نەیاران هەموو دەمێ خەریکی بەڵا بۆ سازکردنم بوو.

زستان بەهەر جۆرێك بوو چوو، بەهار پەیدا بوو، گەورەکانی کورسی پەرستی میللەت فرۆش بە هۆی هاندانی یاسین هاشمی ڕەئیس وزەرای عێراق و ڕەشید عالی بەگی گەیلانی و وەزیری داخلیەی عێراق هاتبوونە کوردستان، کە میللەت بخەڵەتێنن، وەکو دڕێژە بەسەر بهودریان درا، داوی خۆیان داناوە، تەنها منیان پێنەگیراو گەڕانەوە هەولێر، چونکو من زۆر چاك شارەزای یاسین هاشمی و ڕەشید عالی بووم، کە چەندە ناحەزی میللەتی کورد بوون و چەند لەقەیان لە ئیشوکاری کوردایەتی دابوو و بۆ ژێرکەوتنی میللەتی کورد لە چی تەقەلایەکدا بوون. لەبەرئەوە هیچ باوەڕم بەو گەورە کوردانە نەهێناو کەنارگیر مامەوە هەر وەکو لێیدوام.

ئەحمەد بەگ کوڕی تەوفیق بەگ کوردی سلێمانی، کە بە لاوێکی میللەتپەرست، کورد و نیشتمان خواهێکی غیرەتمەندی نواندبوو، لە کوردپەرستیدا زۆر بەرز نیشاندرابوو، یەکێك لە نموونەی میللەتپەرستی و نیشتمانخواهی و بەرزکردنی زانین و فێربوونی کوردایەتی ئەمە بوو:

کە لە سلێمانییەوە گەڕامەوە ڕەواندز وەکو گوتمان دەست لەسەر دەست و کیسە بەتاڵ و پەرێشان زستانم بە زستانێکی سەخت لەسەر دەڕۆیی، دەستەنگی و نەبوونی گەیشتبوە پایەیەکی وا، ئاواتەخوازی مەرگی کردبووم. ڕۆژێك لە وێرانە زاری خانوە کاولەکەمدا نەخۆش و دەردو خەم لەسەر ڕاخەری بێماری کەوتووم و سەرینی دەرد و کەدەرم ناوەتە ژێر سەرم. لێفەی عەیب و عارپۆشم لە پێش چاوی نەیاران بەسەر خۆمدا داداوە. لەژێر باری نەبوونی و پەرێشانیدا دەناڵم و دووکەڵی هەناسەم چۆتە ئاسمان، لە ماڵمدا جگە لە دووکەڵی ئاخ و داخ دوکەڵێك بڵند نابێت و لە چزەی جەرگی برژاوم بۆچروکێك دەرناکەوێت، لە پڕێکدا شورتەیەکی عێراقی هاتە پێش دەرگاکەو خوازتمیە دەرەوە. گوتم نەخۆشم و کەوتووم، ناتوانم بجوڵێمەوە، با بێتە ژوور بزانم چی دەوێت.

بە تکاو خواهشت و پاڕانەوەی خزمەتکارەکەم شورتە هاتەژوور، چاوی پێمکەوت نەخۆشم زۆر دڵگیر بوو، داماو ڕاوەستاو ورد بووەوە، کە بەو زستانە چروسکەی ئاگر نیە ژوورێکی سڕو سارد و تاریك، لەژێر لێفەدا کەوتووم، لە ڕەنگ و ڕووم تێگەیشت و باوەڕی هێنا، کە نەخۆشم. ئەوجا لێم پرسی: خێربێت و چی دەفەرموویت؟ گوتی: مەئمووری مەرکەزی شورتەی ڕەواندز تۆی ویستوەو دەبێت بچیت و بیبینیت، گوتم: باشە با بێمەوە سەرەخۆم دێمە لای. کابرا بە شەرمێکەوە لێوی بزاوت و ڕاوەستا. زانیم دەبێت هەر بچم، بەڵام بێهێزم و توانای بزوتنەوەم نیە، چۆکم دەلەرزێت و سەرم گرانە، ناچار دەستیان گرتم و هەستامە سەرخۆم و بەرگم پۆشی و گۆچانێکم بە دەستەوە گرت و لەسەرخۆو هێواش چوومە سەراو پۆلیس لە پشتمەوە چاودێرم دەکات.

بە دڵەکوتە دەڕۆم و کەوتوومە ئەندێشەوە دەبێت گوناهم چی بێت بەم نەخۆشی و ناسازییە چییان لێم دوێت؟ دەبێت بە ئەزیەت و ئازاردانم چ گەورەیەك بەرز بکەن؟ یان معاشی کام گەورەم پێ زیاد دەکەن وەیان کێ سەردەخەن؟ بەم.. دانەوەیە دەڕۆم، هەتا گەیمە سەرا، نزیك چەند جارێك بۆی دانیشتووم، ئەوجا توانیومە بگەمێ. چوومە لای مەئمووری مەرکەزی شورتە، دانیشتم کەمێك هاتمەوە سەرەخۆ، هەناسەیەکم هاتەوەبەر، ئەوجا مەئمووری مەرکەز ئەمرێکی وەزارەتی داخلییەی نیشاندام، کە دەڵێت:

(بینا لەسەر تەحریری ڕەسمی ئەحمەد بەگ تەوفیق بەگ موتەسەریفی لیوای سلێمانی، حسێن حوزنی، کە لە سلێمانی خەریکی نەشری ڕۆژنامەی ژیان بوو. شیعرو غەزەلیاتی ئەحمەد بەگ کوڕی فەتاح بەگ ساحێبقران زادەی کۆکردۆتەوەو کردوویەتە دیوان کتێب و لەگەڵ خۆی بردویەتەوە ڕەواندز، کە نەشری بکات، لێی وەردەگرن و بۆ ئەم وەزارەتە

(وەزارەتی داخلیە)ی دەنێرن. چونکە ئەو دیوانە موخالیفی قانوونی عیراقیەو نابیت نەشر بکریت، لەهەر جیگایەك بە دەست هەر کەسیکەوە بدیتریت موسادەرە دەکریت).

بەم جۆرە ئەمریکی دوورو دریژ نووسراوەو منیان پێ تەنگەتاو کرد. گوتم: ئەمە راست نیەو نەبوە، هەتا سویندیان دام و سەنەدیان لێ ئەستاندم، کە شتی وا نەبوەو نابیت، گەلیك ئەزیەت و ئازار درام، ئەگەرچی لە سلیمانی ئەو دیوانە نزیك شازدە نوسخەی خەتی و دەستنووسم چاوپیکەوت، هیچ پرسیاریان لینەکرا، تەنها من نەبیت. کە لە سلیمانی بووم هەمیشە هاتوچۆی ئەحمەد بەگم دەکرد و زۆرم خۆشدەویست و پیی سەربەرز بووم، کە کوردیکی وا میشك روون و گەورە لە سلیمانی موتەسەریفە، بەڵام کە لیی ورد بوومەوەو کەوتمە ئەندیشەوە هەروەکو لە کتیبی (بۆچی چوومە سلیمانی) بە دریژی لییدواوم دووبارەکردنەوەی لیرەدا بە پیویستم نەزانی بەڵام کە ئەمرەکەی وەزارەتی داخلیەم چاوپیکەوت، لە دایرەی شورتە، کە گەرامەوە قاقەزیکی دوورو دریژم بۆ ئەحمەد بەگ نووسی و ئەم دوو کەلیمەیەی تیدا نووسرابوو دووبارەی دەکەمەوە، کە گوتبووم: (من وەکو بولبولەکەم بەسەرهات، کە لە سەرەتای بەهارەوە هەتا نزیك زستان لەم چلەو چلەدا بە ئاوازی خوانی بە گول هەلگوتندا بەسەری برد کە بەفر دارو دەوەن و کیو و دەشتی پرکرد، بولبول لە برسان گیژ بوو، بە بیری هاتەوە، کە لە هاویندا میروستانیك لەژیر ئەم دارەدا کوشەوەی دەکرد، پەنای بۆ ببەم، بەلکم دانەیەکم بداتێ لە مەرگ رزگارم بکات. کە چوە ژیر دارەکە بانگی لە دراوسێ پر کوشەوەکی کرد، میروو دەرکەوت، بولبول سکاڵای دلی خۆی خستە پیش میروو بە سەرزەنشتەوە دەنکە گەنمیکی دایەو گوتی: ئەگەر وەکو من رۆژیکی دانەیەکت پیکەوە نابایە، ئەمرۆ دەستی نەبوونیت بۆ من دریژ نەدەکرد. بولبول بە دلشکاوی و هەناسە ساردییەوە فری و چوە سەرچلەکە، باشوویەك هاتوو تیی رۆهات و خواردی) منیش وام بەسەرهات، بە ئاهونالەوە دەژیام و خۆم دلخۆشی خۆم دەداوەو بە ئومید رامدەبوارد، کە شورتەیەکی وەکو باشوو تیم رۆهات. بەو جۆرە دلشکاو و بریندار ببووم، کە بیستم ئەحمەد بەگ بووبە موتەسەریفی هەولیر دەستی بە فەرمانرەوایی کرد لە لیوادا. هەرکەس بە نووسین و تەلەگراف بەخیرهاتنیان دەکرد و چوونە پیشوازی و بەخیرهاتنکردنی، من وەکو کەسیك نەناس و نەشارەزا بێ، بیدەنگی و گۆشەگیریم کردە پیشە.

چەندیك بەسەرچوو خۆم لە مال پەستاوت و دەرنەچووم، قایمقامی رەواندز دوو سێ جار پیی گوتم، کە ئەحمەد بەگ هاتوە، خۆم ناشی کرد هەتا رۆژیك هاتە رەواندز لە مالی قایمقام موراد بەگ میوان بوو. ناردیە دووم، کە چووم زەینەلعابدین ناو مەنسوبیکی سەید تەها لەلای بوو، دانیشتبوون، موتەسەریف گوتی: ئیستە باسی ئیوەم دەکرد، ئەمە چەند مانگە هاتوومە لیواکەتان هیچی ئیوەم نەدیوە، گوتم. من ئیستەش هەر نەخۆشی سلیمانیم چاکنەبوومەوە، کە بتوانم ئاواتمەندی خۆمتان پیشکەشبکەم، لەبەرئەوە بمبەخشن.



تومەز لە پیش چوونمدا گفتوگۆ کرابوو، مەرج بەسترابوو، کە دەبیت رۆژنامەیەك دەرخەم و زەینەلعابدین ئەفەندی کوری خاکی ئەفەندی ببیتە مودیر مەسئوولم، گوتم: ئەمەش وەکو چووینە سلیمانیمە بەوە.. نەدا زۆریان لیکردم، منیکی ستەمزەدەی گیژی دەستی ئیستبداد، هیچ هیزی چەپۆلکەیەکی دیکەم نیە، ئازار و ئەزیەتیکی لە سلیمانی بەسەرم هات و پەریشانی و نەبوونیکی توشمبوو، بۆ گۆرەو شارم بەسە. ئەحمەد بەگ بە زۆر خواهیشت لەگەڵ خۆی بردمیە هەولیر لەگەڵ زەینەلعابدین ئەفەندی چەند رۆژیك ماینەوە. رۆژی دوو شەمە ٢٥ی مایسی ١٩٣٥- ٢١ سەفەر ١٣٥٣ عەریزەو ئیستیدعامان پیکەوە سازکرد، بۆ ئیمتیازی رۆژنامەیەکی هەفتەی دووجار بە ناوی (سۆران) خوازی دامانە موتەسەریف. ئەوراق کەوتە موعامەلەوە، بەڵام یاری و گەمەیەکم لە ئیشەکەدا دەهاتە پیش چاو، بۆم ئاشکرا نەدەکرا و مەبەس چیبوو تینەدەگەیشتم. ئەوراق خوازتنی ئیمتیازی رۆژنامەکە هاتبوە پایان سێ چوار مەئموورانی هەولیر، کە خەلکی سلیمانی و مەنسووبی

موتەسەریف بوون، بە وەرەقە ئاگاداریانکردم، کە زەینەعابدین نەبێتە مودیری ئەم رۆژنامەیە باشە مەبەس؟ نازانم! بۆچی لەوەپێش ئەحمەد بەگ بە زۆر کردمیە هاوەلی و ئیستە چی روویداوە. نازانم. بەلی هەر چەندە مەبەس و ئامانجی موتەسەریف و مەئموورەکانم لی ئاشکرا نەبوو، بەلام هیندە تیگەیشتم، کە ئەم کارە سەرناگریت، ئەگەرچی یەك دوو مانگ بیهودە لە هەولیر تووشی مەسرەف و ئەزیەت بووم لە رەواندز عایلەم بە پەریشانی بەجیهیشتبوو. رۆژیك لە دایرە چوومە لای موتەسەریف، کە مەبەس لە هاتنم و نەگەیشتنە ئارەزووم دەبیت مایەی شتیکی قانوونی بیت و یان سەعادەت مەئابتان لەوە پەشیمان بوونەوە، فەرموویان کە بە دل حەز دەکەم و وەزارەتی داخلیەش دەیەویت ئیمتیازتان بداتێ، بەلام شرووتی قانوونی لە ئیوەدا کافی نیە، گوتم چۆن؟ گوتی: دامەزراندنی مەتبەعە دەبیت خاوەنەکەی لە مەدارسی عالیە مەئزوون بیت.

ناچار گەرامەوە تیکۆشام قانوونی مەتابع، کە لە دەوری عوسمانییەوە مابوو لە عیراقدا بەکاردەبرا، پەیدام کردو بردمە لای، کە نووسراوە، بۆ ئەو کەسە، دەیەویت مەتبەعەیەك لە جیگایەك دامەزرینیت پیویستە بەیانی دامەزراندن و ناوی مەتبەعەکە بداتە مەئمووری ئیدارەی مەرکەزی و ئەو جیگایە. لەوە پتر چیدیکە نەبوو، ئەوجا گوتی: ئیوە لەگەڵ زەینەلعابدین پیکهاتوون. گوتم: بەلێ، ئیوە منتان لەگەڵ ریکخست، بەلام ئەحمەد خواجە ئەفەندی و حیکمەت ئەمین پییان گوتم: وا بە چاك دەزانین، کە زەینەلعابدین نەکەی بە هاوەلی خۆت: منیش قسەکانی ئەوانم بە هی ئیوە زانی، دەمەویست عەرزتان بگەم. گوتی: منیش بە باشی نازانم. بۆچی؟ بێ ئەسباب مایەوە.

لە دوای گەلیك گفتوگۆ لە دایرە دەرکەوتم. گوتم، کە بگەریمەوە رەواندز دەست لەم کیشەو سەرئیشە بەردەم، کەوتمە ئەندیشەی خەیالەوە یەك دوو رۆژ وەك گیژ مامەوە، دەسوورامەوە. یەکیك لە بنەمالە بەناوبانگەکانی هەولیر لاویکی تازەپیگەیشتووی لە حقوق مەئزون تەقەلایدا بوو ئیمتیازی رۆژنامەیەك وەرگریت مابوەوە، هاتە لام پییگوتم: ئەگەر لەگەڵ من ریککەویت، دەبمە مودیری مەسئوولی ئیوە. بە مەرجی ئەوە پیکهاتین، کە ئەو تەنها هەر ناوی مودیری مەسئوولی لەسەر بیت، تیکەل بە هیچ ئیشوکاریکی موجەلەو مەتبەعە نەبیت. لەسەر ئەو پەیمانە چوومە لای موتەسەریف و پەسەندی کرد، بە مەرجی ئەوە، کە مەتبەعەکەی رەواندز بینمە هەولیر منیش نە بە دل و نە بە زمان قبوولم کرد. سەرەتای حوزەیرانی ١٩٣٥ عەرزو حالی ئیمتیازی موجەلەی (روناکی)م دا، رۆژی ١٨ی حوزەیران رەقەم ٤٤١٥ تەئکیدی موتەسەریفی هەولیر بۆ وەزارەتی داخلیە لە خسوس موجەلەی (روناکی)یەوە درا بە وەزارەت. وەختیك ناوی مەتبەعە هینان بۆ هەولیر کرا، وایان زانی کە لە بیرم چۆتەوە.

زۆرباش و بنج و بناوان دوامینی مەبەسیان کەوتم، کە لە سلیمانیش ئەو تەکلیفەم بە توندی لیکرابوو، ئەو مەتبەعە لە رەواندز هەلقەندریت، بەلام زۆر بە نەرمی و لەسەرخۆیی، من ناچار بکەن بە ئارەزووی خۆم بیگویزمەوە، لەوە زۆر چاك ئاگادار ببووم، لەسەرئەوە پەیمانی دا، کە بە هەموو هیزییەوە یارمەتی خۆم و مەتبەعەو موجەلەکەم بدات.

لەسەر ئەو پەیمانە من و شیت موستەفای موحامی خەلکی هەولیر ریك کەوتین بە مەرجی ئەمە ئەو تەنها مودیری مەسئوول بیت و تیکەل بە هیچ ئیش و کاریکی موجەلە و مەتبەعە نەبیت و لە واریدات ئەوەی لە مەسرەفی مورتیب و قاقەزو پیویستی بە مەتبەعە بمینیتەوە بۆ خۆم بیت. سەرنووسەرو مودیری ئیدارە خۆم بم، هەموو ئیش و کاری مەتبەعە لەسەر خۆم بیت. بەو جۆرە، کە پیکهاتین عەریزەیەکمان پیکەوە دا بە ناوی (روناکی) موجەلەیەکی هەفتەیی ئەدەبی ئیجتیماعی تاریخی کوردی لە هەولیر دەرخەین و مودیری مەسئوول موحامی شیت موستەفا بیت و مودیری ئیدارەو سەرنووسەر حسین حوزنی موکریانی. ئیستیدعا بە موتەسەریف درا، زۆری پینەچوو ئیمتیازمان لە وەزارەتی داخلیەوە بۆ هات، نوسخەی یەکەم و دوەمی موجەلەی (روناکی)م لە موسل لە مەتبەعەی (موصل الحديث) چاپکردو هینامەوە هەولیر بلاومکردەوەو چەند نوسخەیەکم لە مەتبەعەی زاری کرمانجی رەواندز چاپکرد. موتەسەریف ئەحمەد بەگ، کە ئیمتیازم بۆ هات پییگوتم:

مەتبەعەی رەواندزت بینە هەولیر. پیمگوت، کە مەسرەف و پارەی گەرەکە، با کەمیك ئیشتراکی موجەلەکەم دەستکەویت، پیویستی مەتبەعەی رەواندز چیبیت پیکدینم و جیگایەك لە هەولیر بە کرێ دەگرم، ئەوجا دەچم مەتبەعەکەم دینمە هەولیر. هیشتا هیچ یارمەتیم نەکرابوو، دو نوسخەش لە موجەلەکەم بلاوکردبوەوە، پارەی مەسرەفم لە یەکیك لە بازرگانەکانی هەولیر، کە بە ناوبانگن ئەسعەد چەلەبی کوری حاجی مەلا شەریف دەباغ کوری حاجی قادر دە دینارم لی قەرز کردبوو، دابووم، لەو دەمەدا موتەسەریف ئەحمەد بەگ بۆ تورکیا دەچوە سیاحەت رۆژی پینجشەممە ٢٢ی ئاغستوسی ١٩٣٥-٢٢ ی جەمادی یەکەم شەوێ پیکەوە بووین. سبەینێ رۆژی پینجشەممە، کە ئوتومبیلی بۆ سازکرا پییگوتم: وا دەچم دەتەویت چی بکەیت هەتا دیمەوە. پیمگوت منیش دەگەریمەوە رەواندز، چونکو پارەیەکم دەست نەکەوت، کە بتوانم موجەلەکەمی پێ بژیەنم. چوە ژووری خۆی بە تەلەفۆن بە یەحیا بەگ کوری عەبدولا موخلیس بەگ برازای پاشای کۆرەی رەواندزی گوت، کە وەکیلی موتەسەریف بوو. حسین حوزنی یارمەتی لە ئیوە دەویت بۆ موجەلەکەی یاریدەی بدەن، لە دوای ئەوە سواربوو چوو دوو مانگی رەبەق لە تورکیا مایەوە.

منیش دەستبەجێ چوومە دایرە چاوم بە یەحیا بەگ کەوت و پرسیارم کرد، کە لە دایرەیەکی قانونیدا چم بۆ دەکەیت؟ گوتی: ئیشتراکی موجەلەی لەلای کێ بێت یارمەتیت دەکەم بچوو بیئەستێنە. بۆ قایئمقامی مەخموور و بۆ قایمقامی کوێسنجەق و ڕانیەو بۆ قایمقامی ڕەواندز هەریەك بە جودا تەوسییەی دامێ. عەبدولقادر ڕەشید وەکیلی قایمقامی مەخموورو عەلی سەروەت بەگ مودیری ناحیەی گوێڕو رامز بەگ کوڕی عەبدولاّ سافی بەگ یەعقوبی قایمقامی کویسنجەق زۆر پیاوانەو بە غیرەت تیکۆشان و بەدەلی ئیشتراکیان بۆ وەرگرتم و دایانمێ. لە رانیەوە دیسان بۆیان ناردم. بەلاّم لە ڕەواندز قایمقام موراد بەگ ناو کوردی عەشیرەتی گییژ؟ جگە لە ئیشتراکیك پارەی پینەدام. لە سلیمانی و قەزاکانی لیوای موسل دیسان بوونە موشتەری موجەلەکەم. نزیك پەنجا دیناریکم بۆ کۆکرایەوە. پتری لە قەزای مەخموور کۆکرایەوە.

ڕۆژی پینجشەممە ١٩ی ئەیلولی ١٩٣٥ چوومە موسل لەگەلّ عیسا مەحفووز ناو گفتوگۆی کرینی مەتبەعەیەکەم کرد. پاشی ٦ی تشرینی یەکەم هەستام لەگەلّ مودیری مەسئوول موحامی شیت چووینە موسل لە مەتبەعەی (موصل الحدیثة) ماکینەیەکی گەورەی مەتبەعەو هیندیك حروفاتم کری و چل دینارم پیشەکی داو شەست دینار بە کۆمپیالە مایەوە، کە بە سەد دینارم کریبوو، دە دیناریش هیندیك حروفاتم پیکری. ڕۆژی سیشەممە ٨ی تشرینی یەکەم ماکینەکەم هەلگرت بە لۆری و هینامە هەولیر لە لایەکی موسافیرخانەی (دار الضیف)ی بەلەدییە ژووریك بەرامبەر بە دایرەی بەرق و بەریدی هەولیر بوو، ماکینەم دامەزراند.

بەلاّم چونکو پیویستی نەبوو حروفات کەمبوو، نەمتوانی جاری کاری پیبکەم، ناچار دوو نوسخە لە موسل و نوسخەی (ڕوناکی) دیکەم دەناردە ڕەواندز لە چاپخانەی خۆم لە ڕەواندز چاپم دەکرد و دەمهینایە هەولیر بلاّوم دەکردەوە.

ئەحمەد بەگ ڕۆژی یەك شەممە ١٢ی تشرینی یەکەم ١٩٣٥ لە تورکیاوە گەراوە چاوی پیکەوت، مەتبەعەیەکی زۆر زەلامم کریوەو لە موسلەوە هیناومەتەوە هەولیر و بەناوی مەتبەعەی زاری کرمانجی دامەزراندوە. ئەوە لە ئارەزوی ئەو دوور بوو لەگەلّ یەحیا بەگ بە دەمەقالە هاتن و گوتی: من ئەمە لە تۆم ئومید نەدەکرد، کە بەم پایەیە یارمەتی حسین حوزنی بدەیت، کە بتوانیت مەتبەعەیەکی دیکەش بکریت. من هەر دەمویست هیندە یارمەتی بدریت بتوانیت مەتبەعەکەی ڕەواندزی پێ بینیتە هەولیر، یەحیا بەگ، کە کوردیکی خوینپاك و لە بنەمالەیەکی حوکمرانانی کوردستان بوو، خزمەتیکی وای لە خودا دەویست، کە پیی بکریت، زۆر باش جوابی ئەحمەد بەگی داوەو ئەهمیەتی پینەداو ئیفتیخاری بەوەوە کرد. کە توانی یارمەتیم بدات.

ئەحمەد بانگی منی کردو گوتی: مەرجی ئیمە ئەوە نەبوو، کە یارمەتی بدرییت و مەتبەعەکەی ڕەواندز بینیە هەولیر؟ گوتم وایە! بەلاّم من، کە ورد بوومەوە ئیشەکەم خستە بەرچاوان تیگەیشتم، کە بۆ دەنگ و ناوی ئیوە وا چاکترە، کە مەتبەعەیەکی سەرلەنوێ لە هەولیر دامەزرینم و دەست لە مەتبەعەکەی ڕەواندز نەدەم، چونکو لە تاریخدا دیتە گوتن و دەبیژرێ لە ڕۆژی هەرامەدا ئەحمەد بەگ موتەسەریفی هەولیر، چونکو دەیەویست خزمەتی میللەتی خۆی بکات، مەتبەعەیەکی لە هەولیر دامەزراندو مجەلەیەکی کوردی بە ناوی (ڕوناکی)یەوە نەشر کردو بۆ مەعاریف و سەرکەوتنی کوردان تەقەلای دا. ئەمەش ڕاستەو ڕاست ناو دلمەو مەبەس و ئارەزووم لەم مەتبەعەیە ئەوە نەبیت هیچی دیکە نەبوە. وا بزانم بۆ ئیوەش بۆ لاپەرەیەکی تاریخی هەولیر ئەمە چاکترە، نەك بلیین ئەحمەد بەگ خۆی بە کورد و کوردپەرست دەزانی لەگەلّ ئەوەشدا ناردی مەتبەعەیەکی کەنەفتی کوردی لە ڕەواندز بوو بە فیل هینایە هەولیر و پوچی کردەوە، تاکو تروسکەیەکی نەشریات، کە لە ڕەواندز مابوو بیکوژینیتەوە.

ئەحمەد بەگ کەمیك خۆی هەلەکردو گرژ بوو. لە پاشان گوتی: تۆ چۆن مجەلەت بۆ کەس نەناردوەو پارەی مجەلەی سالیکت کۆکردۆتەوە؟ گوتم: بە پەیرەوی ڕۆژنامەدارەکان هەر کەسیك نوسخەیەك لە مجەلە یان ڕۆژنامە وەرگریت بە ئیشتراکی سالیك دەژمیردریت و دەخریتە دەفتەری بنەچەکەی ئیدارە خانەکەیانەوەو بە سەنەد پارەی لی وەردەگیریت. هەتا ئەو ڕۆژنامە یان مجەلەیە دەرچیت بۆی دەنیریت، کە قەزاو قەدەریك بەسەر بیت و یان لەبەر شتیك گرێ بدریت و لە نەشر بکەویت خاوەندەکەی مەسئولی قبول ناکات. من تاکو ئیستە چوار نوسخەشم بۆ ناردوون، ئەوجا چووم بەدەل ئیشتراکم لی خوازتوون و ئەو پارەیە کە لە مەخموور و گویرو کەندیناوەم کۆکردونەوە تەنها ئیشتراکی مجەلەی ڕووناکی نیە. یەحیا بەگ لە ڕوویی گەورەییەوە نزیك دوو سەد دانە کتیبی تاریخی (میرانی سۆران)ی بۆ فرۆتووم و داویەتە گەورەکانی دزەیی هی دیکەو لە کویسنجەق حاکم ئەورەحمان سەعیدم لەگەلّ بوە. کە رامز بەگ یەعقوبی پتر بە فرۆتنی کتیبی میرانی سۆران یارمەتی داوم. ئەگەرچی بەدەلی ئیشتراکی سالیکی موجەلەکەم، کە وەرگرتوە قانوونییە، خیلاف قانوونم وەرنەگرتوە.

کە وردبوومەوە ئەحمەد بەگ بیانووم پیدەگریت و مەبەسی ڕاستیەکەی ئەمە بوو مەتبەعەی ڕەواندز ببەمە هەولیر و ئەو مەتبەعەیەم نەدەبوو بکریبا، دیسان وەکو لە سلیمانی بیانووی پیدەگرتم و پیی لیدەچەقاندم، ئەلبەتە دەبیت مەتبەعەی ڕەواندز ببەمە هەولیر و ئەو مەتبەعەی کریومە بیدەمەوە بە خاوەندی.

لەسەر ئەوەش چەندێك تووشی دڵساردی و ناگوزیری بووم و دەستم نەدەچوو ئیش کار و مەتبوعات. بەهەر جۆرێك و بەهەر ڕێگایەکی بمتوانیبایە بۆی دەچووم و دەپاڕامەوەو تێمدەگەیاند، کە تێکدانی مەتبەعەی ڕەواندز مایەی بەدنامیەو ئەم مەتبەعەیە لە هەولێر بۆ ئێوە سەربەرزی دەبەخشێت بێ سوود بوو، بەڵام تێگەیشتم، کە ڕۆژی شەممە ١٤ی کانوونی یەکەم ئەو ساڵە وەزیری داخلیە ڕەشید عالی هاتە هەولێر و مواجەهەم بوو لەگەڵی و سبەینێ هەتا گوێڕ لەگەڵی چووم، ئەو ئەحمەد بەگی موتەسەریفی هاندابوو. کە ئەزیەتم بدات و مەتبەعەکانم لێ تێکبدات. ئەحمەد بەگ کەوتبوە تەقەلادانی بیانوو پێگرتنم.

مەتبەعەکەم پێ ڕێکنەکەوت و پێویست و حروفاتی تەواوم بۆ نەکڕدرا، یەك دوو کۆمپیالەشم بۆ خاوەندەکەی پڕ کردەوەو هێندێك حرفاتم بۆ کڕی. ناچار هەستام چوومە بەغدا، کە پێویستی مەتبەعەکە پێکبێنم و بەڵکم لەوێ هێندێك کتێب بفرۆشم و چەند ئیشتراکێك لە نایبە کوردەکان وەرگرم، مەتبەعەکە بکەمە مەتبەعەیەکی ڕێکوپێك، کە گەیشتمە بەغدا کوردەکانی بەغدا لەژێر گەرانی عەلی کەمال بەگ کوردی سلێمانی بە هۆی ڕەشید عالی وەزیری داخلیەوە لە کۆشەوەیەکی گەورەدا بوو و لەژێر دەستوورێکی داپۆشراودا داوای چوار پێنج مادەیان گۆیا بۆ کورد دەکرد، بەڵام لێرەدا تەنها بەجێهێنانی ئارەزووی ڕەشید عالی نەبێ چیدیکە نەبوو:

١–داوای کۆمەڵەیەکی کوردیان دەکرد لە بەغدا دامەزرێت.

٢–نادییەکی کوردی بە ناوی سەلاحەدین لە بەغدا.

٣–لیوای دهۆك لە موسڵ بکرێتەوەو ببێتە لیوایەکی کوردی.

٤–خانەقین لە لیوای دیالە لە بەعقوبە بکرێتەوەو بکرێت بە لیوایەکی کوردی.

٥–مەدارسی لیواکانی کوردو ئیدارەی حکومەت بە کوردی بن.

بۆ ئەوە هەموو کۆبونەوەو تەقەلایان دەدا، بەڵام لەلای من وەکو کۆمەڵەیەك لە گەورەکانی کوردی بوون، کە یاسیان کراو هاتبوونە ڕەواندز. ڕەشید عالی و یاسین هاشمی مەبەستێکی شەخسی خۆیان تێدابوو، نەك بۆ کورد– بەڵام شکلی بزوتنەوە گۆڕدراو لە ڕیزی دەستووری ڕەشید عالی دەرچوو. بە ڕاستەقینە بوو بە مەسەلەیەکی کوردستان و لە مەجلیسی نوابدا هەرا پەیدا بوو، بوو بە مایەی پشێوی نێوانی نایبی کورد و عەرەب.

لە دوامیندا ئەمین زەکی بەگ کوردی سلێمانی، کە لەو دەمەدا وەزیری ئەشغال بوو، بۆ خۆ پێشخستن لەلای حکومەت و عەرەبەکان بە فرۆفێڵ مەسەلەکەی کوردی خستە دەست و نایبە کوردەکانی یەك و دوو لێککردن و بردنیەوە لای ڕەشید عالی وە تەنها لەوانە دوو کەس مان یەکێك عەلی کەمال بەگ دوەم مەلا حەوێز ئاغای غەفووری کۆیی. هەریەکە لەوانی دیکە بە پەنهانی یەکدی چوون و خۆیان هاوێژتەوە لای ڕەشید عالی ناویان لە دەفتەری بە تایبەتی هەیە.

منیش هێندێك حروفاتی باشم لە مەتبەعەی (الدليل) کڕی و هێندێکی دیکەشم لە مەتبەعەی (عزرا ئەلیاهو) کڕی و ناردمەوە هەولێر، لە پاشان بۆ خۆشم گەڕامەوە هەولێر.

هەر کە گەیشتمە هەولێر لە ئوتومبیل دانەبەزیم، مستەفا بەگ برای ئەحمەد بەگ موتەسەریف و ئاغایەکی ڕانیەشم لەگەڵ بوو، چوومە قەسری موتەسەریف لەوێ میوان بووم، سبەینێ ڕۆژی عارفەی جەژنی قوربان سواری ئوتومبیل بووم چوومەوە ڕەواندز جێژنم لەوێ کردو ڕۆژی پینجەمی جێژن گەڕامەوە هەولیر. لە پیش چار ریگانەی خانزادو سەلاحەدین و موزەفەرەدین، کە کەوتۆتە پیش دەرگای قەڵاوە کۆشکیکی بەرزم بۆ مەتبەعەکەم لە ڕۆستەم چەلەبی بازرگانیکی هەولیری گرت و ناردم لە موسلەوە شاگردیکی زۆر زرنگم بۆ هات و مەتبەعەکەم گویزتەوە ئەو جیگایە.

ئەو ڕۆژەی مەتبەعەم گویزتبۆوەو دامدەمەزراند، چوومە پۆستە هینديك پارەم حەوالە بۆ هاتبوو وەریگرم، قاقەزیکی داخلیم بۆ هاتبوو، دایانە دەستم، کە کردمەوە بەیاننامەیەك بوو بە کوردی نووسرابوو: هەی کوردان چیدیکە خۆ بیدەنگ مەکەن و بخرۆشین و دوو شیعری حاجی قادری کۆیی لی نووسرابوو. لە سەرەوەی بەیاننامەکە دوو خەنجەری سووری لی رەسمکرابوو. زانیم، کە موتەسەریف بە بیانوەو منیش بم بەیاننامەیە تووشی ئەزیەت بکات. بە پۆستەچیم گوت: ئەمە زۆرن؟

هەستام چوومە لای موتەسەریف و بەیاننامەکەم دایەو پیمگوت تکام ئەمەیەو باوەرم پیبکە من شتی وا پرووپووچ و قۆر ناکەم، منیش تیوەرمەدەو بە قسەی نەیارانم لەگەل مەکە. لەمە، کە بەیاننامەیە ئاگادار نیم، چونکو ئەگەر بمەویت شتیکی زۆر لەمە گەورەتر و گیاندارتر بنووسم و لە مجەلەکەمدا نەشری دەکەم. بۆچی بە پەنهانی شتی وینەچووی بیگیان و بیکاری وەکو ئەم بەیاننامانە دەنووسمەوەو بلاویان دەکەمەوە. بەلی قسەکانی من لەلای موتەسەریف جیگیر نەبوو.

وا تیگەیشتم، کە ئەمە بوو، کە چەند سالیك لەوە پیش یانی سالی ١٩٣١ لە هەولیر (حزب الاخاء) کە حزبی یاسین هاشمی و رەشید عالی بوو دامەزراندرابوو، منیان لە رەواندزەوە خوازتە هەولیر شیخ عەبدولقادر نەوەی مەرحوم شیخ ئەبوبەکر، کە عزوی حزب بوو کەوتە نیوانی من و رەیسی حزب، کە شیخ موحەمەد کوری شیخ ئەسعەد بوو، من نەمەویست و داخلی حزب نەبووم و گەلیك پەیمان و مەرجیان نیشاندام و بۆ مەتبەعەو جەریدەو مەتبوعاتەکانم یارمەتیم بدەن و سێ رۆژ رایانگرتم و دلخۆشیان دامەوەو تەمایان وەبەرنام، پیوە نەبووم و گویم نەدایە. لە



دواییدا، كە تێگەیشتن مل نادەم و خۆ تێكەڵ بەو حزبە ناكەم، كە كوردی نەبێت تكایان لێكردم، كە خەڵكی هەولێر و كوردەكانی دەرەوە هان نەدەم بۆ ئەمە نەیاری ئەم حزبە بكەن. بێدەنگ مامەوە نە گوتم (ئا) و نە (نا) هەستام چوومە ڕەواندز.

بە ڕاستی لە ڕەواندز نە بە چاك و نە بە خراپ لەو حزبە نەدوام، بە گۆشەگیری ڕامبوارد، مانگێك لەوە بەسەر نەچوو زانیم، كە سلێمان بەگ كوڕی عەلی بەگ سەلاحشۆڕ، كە لە بەگزادەكانی سۆران و لە تیرەی ئۆغوز بەگییان بوو، چوە بەغدا بە هۆی عەلی حەیدەر بەگی كوڕییەوە، كە لە بەغدا وەزیفەی گەورەی هەبوو، داخلی حزبی الاخاء ببوو و گەڕابوەوە هەولێر، ڕەیس حزبی الاخاء هەولێری دیبوو، دەستووری حزبەكەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، نیشانی دابوون و گەڕابوەوە ڕەواندز لەگەڵ مەرحوم شێخ كاكەمین سەلان، كە دۆست و خۆشەویست و یارێكی بە ڕاستی من بوو یەكدیان دیتبوو، شێخ كاكەمین یان كردبوو بە ڕەیسی حزبی الاخاء ی ڕەواندز و بە هاندانی ڕەشید عالی و یاسین هاشمی، شێخ عەلائەدین كوڕی شێخ عومەری بیارە، كە مورشیدی نەقشبەندی و یاسین هاشمی خۆی بە موریدی ئەو دەزانی قاقەزیان بۆ شێخ كاكەمین سەلان ناردبوو، كە ریاسەتی حزبی الاخاء ی ڕەواندز قبوڵ بكات. سلێمان بەگ دیسان چوبوە لای لەبەرئەوە، كە شێخ كاكەمین لە خەلیفانی بیارە بوو و شێخ عەلائەدین تەوەسوتی كرد بۆ ئەو ڕیاسەتەی قبوڵكردو ئەحمەد كەمال كوڕی عەبدولكەریم خەتی كرابوو بە سكرتێرو حزب لە ڕەواندز دامەزرابوو.

لە نێوان ئەهالی و سەپان و جوتیار و شوان و گاوان و دارکێش و كەردار و ڕەنجبەرانی ڕەواندزدا بەم جۆرە چاوەڕاو كرابوو، كە (هەركەسێ مەنسوب بەم حزبە بێت، ئەگەر قەرزدار بێت و ماڵی خەڵكی خواردبێت پیاوی كوشتبێت و هەرچییەكی بیەوێت و ویستبێتی و كردبێتی و بیكات حكومەت ناتوانێت چی پێبڵێت و شورتە ناتوانێت بیگرێت و مەحكەمە گوناهكاری ناكات و هەرچییەكی ئارەزووی بێ بە ئازادی و بێ پرسیار دەتوانێ بە جێی بێنێ).

دەبێت ئەو فێركردن و چاوڕاوەی لە ڕەواندز كرا لە هەولێرو جێگاكانی دیكەش كرابیت. دیارە میللەت نەزان و نەدیتەیە، شتی وای لە پیاوانی گەورە، كە بیست بە ڕەحمەتی دەزانن و هەریەك لەوانەش گوناهیكی هەر لێ ڕوودابوو، یان دزی كردوە، یا قەرزدارە یان دەیەویت ماڵێ خەلك بخوات یان خویندارە یان خویناوییە بۆ ڕزگای و پەرەی كاری خۆی بە پۆل و دەستە دەستە داخلی حزب دەبوون هەتا لە ڕەواندز هیچ داركیش و سەپان و ماست فرۆشەكانی دیهاتانیش نەما هاتبوونە ڕەواندزو داخل بە حزب ببوون، بەڵام تێگەیشتوو و ئاغاو گەورە پیاوەكان بە گۆشەگیری چاوەنواری دوامینی ئەم كارە بوون، كە نەیاندەزانی چۆنەو چۆن بە پایان دەگات، تێكەل نەبوونیان جاری پەسەند كردبوو.

من گۆشەگیر لە ماڵی خۆم دەرنەدەكەوتم و دەم بە دەم و دەقیقە بە دەقیقە پیم ڕادەگەیەندرا، كە فولان و فولان چوونە حزبەوەو ئەمەو ئەوەیان پیگوتوون، هەتا ڕۆژێك ئیوارە نزیك ڕۆژئاوا بە سەعاتیك ڕەیسی جەیشی عراقی ئەمین ڕەواندزی، كە كوردیكی پەتی و برایەكی ڕاست و دۆستیكی بێ قریژم بوو، هاتە ڕەواندز، كە فەوجەكەیان لەو دەمەدا لە دیانان دەبوون، ئەحمەد كەمال خەتی سكرتیری حزبی لەگەڵ خۆی هەلگرتبوو، هاتنە لام بۆ ماڵەوە، بەڵام هاتنیكی زۆر دلگیرانەی هەم و خەم هینەریكی دلسۆزانە.

هەر كە گەیشتە پیش گوتی: هەستە ڕامەوەستە لەگەڵ ئەحمەد كەمال بچۆو بۆ تەكیەی شیخ كاكەمین داخلی حزب ببە، ئەگەر ئیستا نەچی كۆمەلەی حزب لە تەكیە كۆبوونەوە، دینە سەرتان تالانت دەكەن و بە جاریك مەتبەعەو مال و ئەشیات دەبەن و خۆشت دەكوژن ئیدی وەختی ڕاوەستان و خۆڕاگرتن نیە.

من بەبێ خۆڕاگرتن پیكەنینم بەو قسەو هەرەشانە هات و گوتم كاكی من لە هەولیر ویستمیان پەسەندم نەكرد و گەرامەوەو ئیستا چۆن دەمەویت خۆم بخەمە حزبیكەوە، كە بە نەیاری و ناحەزی میللەت و نیشتمانی من دامەزراندرابێ ئەمە چی تیگەیشتنیكە، كە تۆ تیگەیشتووی؟ من ئەگەر پارچە بكرین و تۆزم نەمینیت داخلی ئەو حزبە نەبووم و نابم ئەوەش، كە گوتوویانە باوەری پیمەكەن، چونكو شیخ كاكەمین یەكەمین دۆست و هەمرازی منە، سلیمان بەگ خۆشەویست و دۆستمە باوەرناكەم شتیكی بۆ من خراپ بیت بە زیان و بیری خۆیاندا بینن، بە تایبەتی ئەحمەد

کەمال چۆن مەیدان بەوە دەدات، کە هەڵمەت بێتە سەر من. ئەو قسانەی من ڕەیس ئەمین ڕەواندزی چەند بارە کرانەوە. لە دوامیندا ناچاریان کردم لەگەڵ ئەحمەد کەمال بچمە تەکیەو چاوم بە شێخ کاکە مین و سلێمان بکەوێت.

هەستام لەگەڵ ئەحمەد کەمالدا کەوتمە ڕێ و ڕەیس ئەمین گەڕاوە دیانان، کە نزیك تەکیە بوومەوە کوچەو کۆڵان و دەورو بان و حەوشەی تەکیەو ژوور پڕن لەم فەقیر و هەژارانەی بێ زیان و بێ هۆشانەی شارو دێهات و شوان و گاوان و دارکێش و کەردار و چارەداری ناحیەو شار. بەهەر جۆرێك بوو بڕمان پێدان و ڕێگای چوونمان کردەوە، بە شانەسوو گەیشتینە تەکیە، کە چوومە ژوور هەموو بە پێوە ڕاوەستابوون. جێی دانیشتن نەمابوو، تەنها شێخ کاکەمین و سلێمان بەگ لەبەر میحرابی مزگەوت دانیشتبوون. من لە دوورەوە بە دەنگێکی بەرز سڵاوم کرد و چوومە پێش، لە نێوانی هەردووکیاندا دانیشتم، جوابی سڵاویان نەدامەوە، هەموو بێدەنگ تەماشای یەکدیان دەکرد.

تێگەیشتم ئیش لە ئیش ترازاوەو لەگەڵ ئەمانە تێگەیشتن و گفتوگۆ بێسوودە، هەستامە سەرخۆم، دوورو درێژ خوتبەیەکی دینی و وەعزێکی پڕ مەعنای بە گیانم بۆ گوتن و هاوارم کرد، کە: مادامە ئێوە موسڵمانن و باوەڕتان بە خوداو پێغەمبەرو قورئانی هەیە دەبێ پەیڕەویان بکەن، خودا لە قورئاندا هەموو موسڵمانێکی کردۆتە برای یەکدی. بە ناوی ئیسلامیەتەوە لەم مزگەوتەدا کوردێك و تورکێك و هیندێك و فارسێك و چەرکەس و جاوەیەك و عەرەب و زەنگییەك دەتوانن کۆببنەوە و لە پشت ئیمامێکدا نوێژ بکەن و وەکو برایان یەکدیان خۆشبووێت. کەوابوو حزب الاخاء بۆ چیە، دینی ئیسلام هیچ پێویستی بەم حزبە نیە، لە قورئاندا هەموو ئەحکامێك لە خودا بە ئێمە ڕاگەیەندراوە، شتێکی تێنەگەیشتبین فوقەها بە درێژی و ئاشکرا بۆ مەیان دیار کردوەو تاکو ئێستاش لەنێو حکومەتێکدا حکومەتێکی دیکە دانەمەزراوە، قانوونی حکومەتی عێراقی چی وای تێدا نیە، کە هەرکەس داخلی حزبی الاخاء بوو لە هەموو گوناه و قەرزداری و خوێنڕێژییەك چاوی لێدەپۆشرێ و هەرچییەکی بیکا دەبەخشرێ، باوەڕ بکەن و ئەمە ڕاستیەکەیەتی، کە پێتان دەڵێم. هەر کەسێك گوناهێکی. کە ئێوەی پێ فریو دراون لێتان رووبدات، حکومەت بە پێی قانوونی عقوباتی بەغدادی بە جەزاتان دەگەیەنێت و ڕزگار نابن و حزب الاخاء ناتوانێت خیلافی قانوون کەسێك لە جورم ڕزگار بکات. قانوون لەسەر هەموو شتێکەو فەرمانی بەسەر هەموو کەسێکی عێراقی و غەیرە عێراقیدا لە خاکی عێراقدا ڕەوایە.

بەو جۆرە دوورو درێژ پێمگوتن و بێدەنگبووم. چەند کەسێکی سەرهاتی کۆمەڵەکە پێیان گوتم:

ئێستە دەبێ چی بکەین؟ گوتم: ئێوە، کە موسڵمانن دەچنەوە سەر ئیش و کاری خۆتان و پشتگەرم دەبن، هەر کە بانگدەر بانگی دا وەرن مزگەوت دەستنوێژی خۆتان بشۆن و نوێژی خۆتان بە جەماعەت بکەن و بگەڕێنەوە سەر کار و پیشەتان و خیلافی ئەمری خوداو پێغەمبەرو، ئەمری حکومەت نەبزوونەوە، خودا لە قورئاندا فەرمویەتی ئیتاعەی خوداو ئیتاعەی پێغەمبەر بکەن، لە هیچ ترستان نەبێت. پیاوانی خودای لە خودا پەرستیدا کڕین و فرۆتن و بازرگانیدا پەکیان ناخات. ئیدی کەوابوو ئەم حزبی الاخاء بۆ چیەو ئێوە مادام بارگرانی دین و ئەمری حکومەت هەر هەڵدەگرن باری حزبێکی بەکاری دین و دنیاتان نەیە بۆچی دەخەنە سەرشانی خۆتان و خۆتان بەدناو و ڕەزیل و ڕسوا دەکەن. تاکو چەند کەسێکی دیکە بە ئێوە خۆ بەرز دەکاو هاتی ئێوە دەخوا. ئێوە بۆ خۆتان بیخۆن و ئیتاعەتی حکومەتی خۆتان بکەن و بە ئەدەب و ویقارەوە لەگەڵ کاروباری خۆتان خەریکبن.

چونکو میللەت دڵپاك و خاوێن بوو قسە ڕاستەکانی منیان بە گیان و بە دڵ پەسەند کردو بە دەنگێکی بەرز گوتیان بەخودا قسە قسەی تۆیە، لە گۆتەی تۆ دەرناچین و تەقەیان تێکەوت بڵاوبوونەوە. یەکێ لە تەکیەدا نەما، منیش لە گەڵیاندا دەرچووم. سلێمان بەگ هەر هێندەی گوت: (هەی لە بابی منت کەوتبێ، چاکت تەفرو توونا کردن).

منیش بێدەنگ لە تەکیە دەرکەوتم و گەڕامەوە ماڵی خۆم. لە دوای من شێخ کاکەمین بەبێ ڕاوەستان هەڵدەستێ و سوار دەبێ بۆ سەلان دەگەڕێتەوە. لە سەعات سێی شەودا ڕەزا بەگ، کە قایمقامی ڕەواندز بوو، دەنێرێتە دووی سلێمان بەگ و سەنەدی زەمانی پێنج سەد دیناری لێ دەستێنێت، کە جارێکی دیکە تێکەڵ بەو جۆرە کۆمەڵەیە نەبێ.

ئەوەی، کە گوترا ئەسبابێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی شێخ محەمەد، کە ئێستە قازی شاری هەولێرە هان بدات، بە نەیاریم تێبکۆشێت و کەلێن دەستخات بۆ ئەمە تووشی ئازارو ئەزیەت ببم و عومەر حوسێنی کوڕانی خۆشی هانبدات لە موحاکەمەدا شاهێدیم لەسەر بدەن بە درۆو ئەو سەربهوردانەی حزبی الاخاء یش بە ڕەشید عالی و یاسین هاشمی ڕاگەیەنێت و لەم دەمەدا وەبیرمان بێنێتەوە، ڕەشید عالی و یاسین هاشمی بە تەلەفۆن تەنگەتاو بکەن، کە بیانووم پێبگرێت و تووشی سەتمەیەکم بکەن و چووینە بەغداو مەسەلەی (نادی سەلاحەدین) دامەزراندنیش هەر لەو ئەسبابانە بوو. شێخ موحەمەد شەو و ڕۆژ موتەسەریفی لێ هاندام و موتەسەریف تێنەگەیشتبوو مەبەس چیە، کە شێخ هێندە خراپەی منی لە کن دەڵێت و منیش لەبەرئەوەی دەبوو بە مایەی فەسادی نەمدەویست ڕۆژێ لە ڕۆژان موتەسەریف لەو سەربهوردەیە ئاگادار بکەم، کە لە حزبی الاخاء تووشم ببوو.

موتەسەریف بەبێ لیکدانەوەو بیستنی قسەکانم لوتفیکی لە گەلمدا هەبوو فرییداو بە مودیری شورتەی ئەمرداو حوکمی مەحکەمەی سادر کرد هەر ئەو رۆژە مەتبەعەکەم دامەزراندو کاری تیدا دەکرا، شورتەو موختاری گەرەك هاتنە مەتبەعەو سەرتاپایان پشکنی. دیارە هیچ نەبوو و هیچ نیە، کە بیدۆزنەوە، ئەوە رۆژیکی سەرەتایە، کە ئەحمەد بەگ بوو بە مایەی پشکنینی جیگاو مەتبەعەم و بە مایەی ریکردنەوە بۆ چەپۆلکە خواردنم و حەبس و زیندانی و موحاکەمەو ئەزیەت و کیشەو ئازار و شپرزەیەکی هەتا ئەمرۆکە لیی رزگار نەبووم و بوو بە مایەی بەدناوی و لەکەدار و رەخنەداریم لەنیو کوردانداو بۆ دەرگەوانی بەڵاو موسیبەت و مال ویرانی و خانەلانی و رووتی و برسیەتی و دەستتەنگی و نەبوونیم.

بە تایبەتی پیمگوت سەعادەتی مەئاب من لە رەواندز بە گۆشەگیری سەرم بە دەردی خۆمەوە نابوو بە بوونی و نەبوونی دلنیا بووم، منت بۆچی هینایە هەولیر و بۆچی لەم ئازارو زیللەتەت گریدام، من لەوەپیش هیچ بێ فەرمانی ئیوەم کردبوو، کە سزام ئەمە بیت و لە سلیمانیش لە فەرمانی ئیوە دەرنەچووبووم و بێ قانوونی لە من رویدابوو، کە بەو بۆنەیەوە تۆلەم لیبکریتەوە. لە هەولیر و چی لە سلیمانی جگە لەمە، کە لە دایرەیەکی مەعقول و شەرەفدا کوردم لە ژیر فەرمانی قانوونی مەتبوعاتدا کتیب و تەئلیفاتی خۆم و مجەلەکانم نەشر کردوەو تەنها خاوەند مەتبەعەیەکی کوردم گوناهیك و یانی تەرکی ئەدەبیك و یانی شتیکی بەر ئاوەژووی دەستوور و رەوشتی هەموەتی و قانوون لە من روویدابیت، دیسان دەلیم شایانی ئەزیەت و ئازاردانم بیانوو پیگرتنم.

لەو هەموو قسانە ئەوەی جواب دامەوە و گوتی:

تاکو ئەو دەمە تۆم خوازتبێ و یان بۆ خۆت هاتبیە لای من، لەم دەمە بەولاوە ناتبینم و دەبێ لە هاتوویەکی زۆر دوورو دریژدا نەتبینم و نەتوانم و قسەت لەگەل بکەم.

گوتم کەوابێ ئەمە لە منی ئاشکرا کرد، کە یان بۆ خۆت یەکسەر توورەبوویت و لەمەپیش ویستووتە تووشی گۆنگەلیکم بکەی و بۆت ریکنەکەوتوە، ئیستە ئەمەتان کردە بەهانەو تووشی ئازارم دەکەن و یان لە لایەکەوە هاندراون و یان لە وەزارەتەوە فەرمانت پیدراوە، کە بە هەر بۆنەیەکەوە بیت ئەزیەتم بدەی. جا نازانم لەوانە کامیانەو ئەسبابی ئەم توورە بوون و بیانوانە چیە بە منی دەگرن.

خۆی نەگرت و گوتی: لەمە پتر بکەی، کە چوویتە بەغدا لەگەڵ عەلی کەمال کۆمەلەتان بەستوە، کە من لە موتەسەریفی بخەن و کە گەرایەوە هەولیر لەگەڵ کوردەکان ریککەوی و بە عەزلکردنم بدەی و بەرامبەر بەو خزمەتە، کە بیکەی و رانەوەستی عەلی کەمال و جەماعەتی ئەو حروفاتەیان بۆ کریوی و پارمەتییان داوی ئەم حروفاتانە، کە کردراون بە پارەی ئەوان کردراوە. لەوە زۆر دلگیر بووم خۆم توند کردو گوتم:

تەلیفۆن هەلگرە و موخابەرە لەگەڵ مەهدی حسین خاوەندی مەتبەعەی دەلیل بکەو بزانە ئەم حروفاتانە، کە من لەوم کریوەو ئیستاش چل و چوار دیناری پێ قەرزدارم، کێ کریویەتی و کێ بۆتە کەفیلی و بە واستەی دۆستەکانی بەغداوە بپرسەو لەگەڵ سکرتیری بانگ عوسمان سەلیم ناو جوولەکەیەکە موخابەرە بکە، کە بۆتە کەفیلم، بزانە ئەم حروفاتانە لە کێ کراون و پارەم لە کوێ پیدراوە. زۆر موتەئەسیفم، کە بە قسەی نەیاران ئیغفال دەبیو پیاویکی راست و خۆشەویستیکی وەکو من تووشدەکەن و بە خەتا دەچن. لە پاشان پەشیمان دەبنەوەو تیدەگەن، کە من راست دەلیم و راستم و ئەوانەی بۆیان گیراویەتەوە فەسادیان کرد و درۆ دەکەن، بەڵام بیسودە چونکو ئەزیەتیکی تووشی منی دەکەن، و بەدنامییەکی بەسەر منی دادینن ناگەریتەوەو پەشیمانیش پارە ناکات.

جارێ یەکسەرە من خراپ نیم و خراپە ناکەم و بێ قانوونی نابزوومەوەو شتیکی ئەتك و سووکی و بەدنامی خۆم و میللەتەکەی منی تیدابێ نەمکردوەو نایکەم و شتی وینەچووی لە دەست نەهاتووم بە خۆم و هاوزبانەکانم رەوا نەدیوە بۆی بچم. بە تایبەتی، کە ئیوە بوونە مایەی هاتنم بۆ هەولیرو چاك و خراپی



ئەم لیوایە وا تیگەیشتوون لە حەقی مـن و مـەتبوعاتی کوردیـدا لوتفتـان هەیـەو حـەز بـە بەرزبوونـەوەم دەکـەن و لـەژێر سـیبەری میـهرەبانی ئیـوەدا ئـەم مەتبەعـە نیوەچلـەم پیکـەوەناوە، هیشـتا پینەگەیشتوە دانەمەزراوە.

من، کە خۆم بە کوردیکی راست و بێ قریـژ زانیـوە و بـاوەرم بەمـە هەیـەو دلنیـام ئـەمرۆ لـە خزمـەتی تـاریخ و ئـەدەبیات هـەر بزووتنـەوەیك بکرێ بە قوردا چوونی میللەتەکەو مایەی ویرانـی نیشتمانە خۆشەویستەکەمانەو ئیوەش بەوە باوەرتـانکردوە، کـە من لەوە بەولاوە نیم، کە گوترا. کەوابوو چۆن باوەر دەکەن من لەقە لەو پیت و پیزە هەلکەوتوە بدەم و لە ژیر سیبەری ئیـوەدا، کـە یارمەتی ئارەزووی مەتبەعەو مەتبووعاتم بکەن، من بۆ خراپ بچم و شـتی منداڵانـەی وەکـو ئـەو بەیاننامـە بلاوبکەمـەوە، کـە بـایی پوولیکی سوود نە بۆ من و نە بۆ میللـەت و نیشتمانی تیدایە، وا بـزانم ئەمـە بیانوویـەکی قانوونیـە پیمدەگـیرێ. لــە نیوانــی میهرەبانیدا دەتـانتوانی زۆر بە ئاشکرا ئـەمرم پیبـدەن، کـە ئیـوە دەبێ مەتبەعەی رەواندز بفرۆشن و ئەم مەتبەعـەی، کە لـە هـەولیر دایدەمەزرینن تیکیبدەن و یان بیبەنە جیگایەکی دیکەی دەرەوەی لیوای هەولیر بیت، ئیدی ئەم کیشە و هەراو بیانووانە پیویست نەبوو، بەبێ خۆگرتن ئیتاعەم دەکردو هەرچییەکی ئارەزووی ئیوە بوایە وام دەکرد و لە فەرمانتان دەرنەدەچووم.

گوتی: بیانوو نیـە پیـت دەلیـم ئـەوەی تونـدی و تیـژی بیـت دەینوینم و لە کردەوەش پەشیمانی ناکیشم. ئەمە دووجـارە لـە قسەی من دەردەچی یەك لە سلیمانی پیمگوتی، کـە مەتبەعـەی رەواندز بینیـە سلیمانی، نەتکرد و ئەم جارەش، کـە تـۆم لەگـەڵ خۆم هەلگرت و هینامیە هەولیر پیمگوتی بەم مەرجە یارمەتی تۆو مەتبوعاتت دەکەم، کە مەتبەعەی رەواندز بینیە هەولیر. چووی لە موسل مەتبەعەت کری و هیناتە هەولیر و چوویتە بەغدا حروفاتت هیناوە، دەستت لە مەتبەعەی رەواندز نەدا.

هەلمدایەو عـەرزمکرد ئەمـە راسـتە منیـش لـەوەپیش سـەبەب چیبـوو پیمگـوتـن ئیـوە بیدەنگتـان کـردو رۆژی، کـە مەتبەعـەی هـەولیرم دادەمـەزراند ئەحمـەد فـەرەج لاویکـی تـازە پیگەیشـتووی سلیمانی، کـە تەحسیلی ئـەمریکای هەیـەو لـە دایـەرەی تووتنـدا مۆزەفە هاتـە لام و چـاوی بـە مەتبەعە کـەوت گـوتـی: خۆزگـە ئـەم مەتبەعە لە سلیمانی بوایە نەك لە هەولیر، رۆژیکی دیکە دوو سێ مەئموورانی خەلکی سلیمانی، کە لە هەولیر مەئموورن گوتیان: کە تۆ بۆچـی ئـەم مەتبەعەیـە نابەیتـە سـلیمانی هـەروا سەرزەنشـت کرام.. لەو قسانەو فەرمایشی ئیوە تا ئیستا زۆر باش تیگەیشتم و زانیم، کە نەدەبوو بە میهرەبانی و لوتفی ئیوە بخەلەتیم و بیم بۆ هـەولیر، مادامـە لـە سـلیمانیش بـەم لوتفـە خەلـەتیندرابووم و پەشیمان بوومەوەو قسەو لوتفەکانتان بـۆ نـەهینا هـەولیر دەبـێ ئامادەی ئەزیەت کیشان و ئازاردان و نەگبەت بم. مەبەس تیکدانی مەتبەعـەی رەواندزە، بەیاننامە و قسە بیانوویەکن دروستکراون. ئـەوا منیـش دەرکـەوتم و سـنگی خـۆم کـردە سـوپەری بـەڵاو موسیبەت و جاریکی دیکە چاو بە من ناکەویت مەگەر بە ئەمری رەسمی نەبێ، کە بمخوازیە حزوور.

ئەوەم گوت و لـە دایرە دەرکـەوتم و چوومـەوە مەتبەعـە، دوو پۆلیس هاتن گوتیان وەرە مودیری شورتە تۆی دەویت، کە چووم حەوالـەی مەحکەمـەی کـردم، گوتیـان یـا کـەفیلی سـەد دینـار یـا نیهایەتی مەحکەمەو یان حەبس دەکرییت، هەستام چوومە بازار دوو شورتەیان وەدوو خستم سەید قاسم خەیات ناو دوکانداریکی بەرگدروو بوو بە کەفیل و ئەوراق گیراو سەوقی مەحکەمە کرا.

لـەوە بیخەبەر بووم، کە لاوەکانی تازە پیگەیشتووی هـەولیر پینج و لە کۆیە یـەك ئیتیـهام کرابـوون و لـە حـەبس خرابـوون و خـەریکی شـەهادەتی زورو پیکـهینان و ریکخسـتنی بیـانوو و توهمـەت و ئیفتیرای دیکە بوون. لە تەلەبەکانی رەواندز کۆیە لە رەواندزو کۆیە مالیان پشکندرابوو و یەکیك لە رەوانـدز ئیتیـهام کرابوو. سبەینێ خەریکبوو موحامی بگـرم ضیـا عـەلی موحـامی عـەرەب و خـەلکی موصل لـە هـەولیر بـو، گـرتم و کردمـە وەکیلـی خـۆم، کە مودافەعـەم بۆ بکات. ئەم پیاوە زۆر بە مەردانە گوتـی: مەســـەلەی تــۆ مەســـەلەیەکی میللـــەتی و کوردییـــە، منیـــش عەرەبییـەکی سـاغ و راسـتم، چـۆن بـاوەر بـە مـن دەکـەیت و موقەدەراتی خۆت دەدەیە دەست من و باوەر بە موحامی شیت موستەفا ناکەی، کە مدیری مەسئوولی موجەلەکەتە؟ گوتم: ئەمە، کـە تـۆ دەکەمـە وەکیـل و موقـەدەراتی خـۆم و تەلەبـەکان دەدەمـە دەسـت تـۆ مەسـەلەیەکی ویجدانـی و ئوجرەتـە. لـە ئیـوە دلنیـام خیانـەت لەگـەڵ ئیمانتـان نەکـەن، چونکـو راسـتی دەلیـن، کـە عەرەبیکی راست و میللـەت پەرستن، لەگەڵ منیشدا درۆ ناکەن و راسـت دەبن، بەڵام موقەدەراتی بزنیك چیە نادەمە دەسـت شـیت موستەفا، چونکو پیی باوەر ناکەم، کە کوردیکی راست و دروست بیت.

ضیـا عـەلی موحـامیم کـردە وەکیـل، یاسـین عریبـی موحـامی موصل و مکی جەمیل موحامی بەغدای، کە لە بەغدا بوو و دوو موحامی دیکەی بەغدا و کەرکووکم کردنە وەکیل و وەکالەتنامـەم بۆ ناردن، کە رۆژی موحاکەمە حازر بن و مودافەعەم بۆ بکەن.

بەشیك لە بیرەوەریەکانی: حوسین حوزنی موکریانی

سەر چاوە: روناکی، یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری هەولیر ئامادەکردن و پیشەکی د. کوردستان موکریانی، لە بلاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم ٢٠٠١.

# ڕۆحی ئەو بۆنی مەرەكەبەكەی لێدەهات!

## "بەشێك لە ڕۆمانی پەڕ"

**سەلیم بەرەكات**

"كەواتە ئەم كاغەزەمان بۆ بنووسەوە ئەگەر ماوەت هەیە.

وا پێدەچوو بە ڕاستی بێ، بۆیێ لێم وەرگرت، لێشم عەیان بوو كە دەزانێ چی دەڵێ، وێڕای ئەو قسانەی كە لە تاووتوو كردنی ئەو گومانانەی كە پێشتر كردبوومان و جەسارەت ناكەین ڕەتیان بكەینەوە، كە كاغەزەكەم لێك كردەوە دیاربوو لێوارەكانی خوارببوونەوەو گەچلاّ بوون، بەلاّم پیتەكانی كە هی چاپێكی زۆر كۆن بوون نەغەیرا بوون:

"ئەم پرۆتستانتە ئەڵمانیانە درۆتان لەگەڵدا دەكەن".

دوو جارانم كاغەزەكە خوێندەوە، بێ ئەوەی لە كابرای لەناو ساقۆ ختم بوو بپرسم ئەوە مانای چیە، ئەم كاغەزە چی دەگەیەنێ جگە لە هۆشیاركردنەوەیەك لە لایەن ئەو پرچ زەردە ڕیشدارانەی كە چەند مانگێك بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانی گۆڤاری "كوردستان"یان دەركرد كە بە كوردیەكی شەپڕێو بۆ كوردەكانی ئێران نووسرابوو بۆ ئەوەی لە دەوری هاوپەیمانێتی ئەڵمانی- توركی گرد ببنەوە.. بە لەبەرچاوگرتنی پێداویستیەكانی یەكێتی ڕەگەزی ئاری"؟ بەلاّم من بێ خۆتێهەڵقورتاندنێكی ئەوتۆ لە كابرای ساقۆ لەبەر دەپرسم: ئەمە كێ نووسیویەتی؟ ئەویش پێم دەڵێ:

-حاجی سمكۆ.

بە لێوە لەرزەوە دەپرسم: "چەند دانەی لەبەر بنووسمەوە؟" دەڵێ: "هەشتا هەزار.. ڕادەچڵەكم:

"گاڵتە دەكەی!" لێم دەپرسێ: "دەتوانیت؟"

"بەڵی دەتوانم".. وا دەڵێم

"بەلاّم ئەوە زۆرە". چاوەڕێ نابم ئەگەرەكەم پێ بڵێ لەسەر قسەكانم بەردەوام دەبم:

"بە ئاسانی دەتوانن بە ئامێری فۆتۆكۆپی لەبەری بگرنەوە". بە ئاوڕدانەوەیەك لە هەردوو ڕیزی خەڵكەكە قسەكانی پێ بڕیم:

"حەز دەكەین بە دەستخەتی خۆت بێت!" سەرم سوڕ دەمێنێ:

"وشەكان بە تایپ نووسراون، زیانی چیە ئەگەر بە فۆتۆكۆپی لەبەری بگرینەوە؟

دەڵێ:

"حسێن موكریانی كاری بۆ پرۆتستانتە ئەڵمانەكان ئاسان كرد تا بە زمانی ئێمە لەسەر ئامێر بنووسن". منیش دەڵێم:

"جا موكریانی چ پەیوەندیەكی بە منەوە هەیە؟" دەڵێ:

"پەیوەندی بە تۆوە نیە، بەڵكو بەم كاغەزەوەی هەیە" دەپرسم: ئەو چاپی كردوە؟".

سەری خۆی بە نیشانەی ئا- دەلەقێنێ.

دڵنیام لەوەی كە حسێن موكریانی چۆن هیچ پەیوەندییەكی بە منەوە نیە ئەوهاش پەیوەندی بە پرۆتستانتە تەبشیریە ئەڵمانیەكانەوە نەبوو، بۆ خۆی پارەیەكی كەمی كۆكردەوە كە لە دوو سەد لیرەی توركی تێنەدەپەڕی تا بە سەدو بیست لیرە ئامێرێكی گچكەی چاپ لە ئەڵمانیا بكڕێ و پاشان لە كۆتایی ساڵی ١٩١٥ بیگوازێتەوە بۆ حەڵەب- ئەو چەند هێمایەكی هەڵبژاردبوو كە لە پیتی دەنگەكانی فارسیدا بەكاردەبران و لە عەرەبیدا نیە. دواتریش گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا تا دایانبڕێژێو دووبارە بگەڕێتەوە حەڵەب و یەكەمین كتێبی پێ دەربكات كە ئەویش "مەم و زین" بوو، واتە داستانە شیعریەكەی "ئەحمەدی خانی"ی مەزن كە لە سەدەی چواردەهەمی زایینیدا لەسەر عیشقێك نووسیبووی كە چەندین سەدەیە فرمێسك لە چاوی كوردان بەردەداتەوە. منیشی گرتەوە، دوای ئەوەی باوكم فرمێسكی بۆ ڕشت، ناوی ئەو عاشقەی داستانی خانی بە بەر مندا بڕی.. بەلاّم

تێناگەم.. ئێستاكە تێناگەم ئەم كابرای ساقۆ لە بەرە بۆ پێی باشترە وشەكانی سەر ئەم پەڕە كاغەزە كۆنە بە دەست بنووسمەوە؟! بە كابرام گوت:

"موكریانی، پرۆتستانتە ئەڵمانیەكانی فێری زمانی كوردی نەكرد".

شانی خۆی هەڵتەكاند:

-جا.. جیاوازی چیە..؟" لە پیتەكانی ئامێرەكەی ئەوەوە فێری بوون".

منیش شانی خۆم هەڵتەكاند:

"بەهەرحاڵ لە یەكێكەوە هەر فێری دەبوون".

دڵنیام لە یەكێكەوە هەر فێری دەبوون، چونكە ئەو تەبشیریانە پێش خەڵكانی دی گەیشتنە كوردستان "موكریانی" كە زمانیهیندی و عەرەبی و توركی و فارسی بە رەوانی دەزانی. ئەمە جگە لە زمانە كوردیەكەی خۆی، بە هۆی ئامێرەكەیەوە بەرپرس نەبوو لە هاتنی گەلانی دی بۆ كوردستان، چونكە ئەوان پێش ئەو ئامێرەو دواتریش چاویان بڕیبوە تخووبی (ئێسك و پروسكی بەختەوەری كوردان) بۆ نمونە: "حسێن موكریانی" كە زمانی ڕووسیشی دەزانی نە بە هۆی تیپەكانی و نەبێ ئەوانیش بەرپرسیار نەبوو لەوەی كە سەركردە گەورەكانی كورد پەنایان بردە بەر ڕوسیا تەنانەت زۆریش بەر لە دۆزینەوەی ئەم ئامێرە مەرەكەب زۆرو گچكەیەش، چونكە ئەوان بە هۆی سەركەوتنەكانی ئیمپراتۆریەتی بەستەڵەك لە ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی "بابی عالی" هۆكارێكیان دۆزیەوە بۆ هاوپەیمانێتی تازە.. گومانیش لەوەدا نیە كە ئامێرەكەی "حسێن موكریانی" ساڵی ١٩١٥ هیچ پەیوەندییەكی بە شۆڕشەكەی "مەلا سەلیم"ەوە نەبوو لە "بەتلیس" هەروەهاش بە شۆڕشەكانی "سێرت" و "خارزان" و "بۆتان" و "شێروان" و خاپووت" و "ماردین" و نسێبین" و "میدیا" و "جەزیرە" و "دیاربەكر" و "زاخۆ" و "سلێمانی" و "كەركوك" و "وان"دا، ئەو شوێنانەی كە (٣٠) ساڵ بەر لە ئامێرەكەی موكریانی ڕاپەڕین كە "پێشتر نەخشەیان بۆ كێشرابوو!" تا بچنە ڕووسیا- وەك توركەكان دەڵێن.

ئەمە ئامێرێكە وەك هەر ئامێرێكی دی، كتێبی زۆری كوردی چاپ كردن، ڕستەی زۆر، ناوبانگی زۆر، ئایەتی قورئان، پەسنا، پێشكەوتن، ناو، شیعری سۆفیگەری، مێژووی پشت گوێ خراو، نامە، دیكۆمێنت دەربارەی ڕاپەڕینەكەی شێخ سەعید بە هەردوو زمانی كوردی و فەرەنگی، دوای مردنی موكریانی-ش كە ڕۆحی ئەو بە مەرەكەبەكەی مۆر كرابوو و بۆنی مسی تواوەی لێ دەهات گوێزرایەوە بۆ "هەولێر" دواتر ئامێرەكەش لە خەمی بەش نەكردنی مەرەكەبەكەی مرد.

بەڵام من لە سەرمە هەشتا هەزار دانە لەو ڕستەیە بە دەست بنووسمەوە بێ ئەوەی لێی بپرسم كێ ناوی منی پێ گوتوە.. چونكە من خۆتێهەڵقورتێنەر نیم.. كە سەیری هەردوو ڕیزی ئەو خەڵكەش دەكەم كە لەم داڵانە گەورەیەدا سێبوریەكی كۆنینەم پێ دەبەخشن، چونكە باڵندە بارمتەكانی ناو قەفەزەكانیش خۆیان داوەتە دەست سێبوریەكی كۆنینە كە بە درێژایی داڵانەكە پەرت كراون و لە گۆنگەری ئەو وتووێژە بڵندانەی سەر لێوەكان لەبەر كزی ڕووناكیەكە نابیندرێن، بەڵام ئەو كابرایەی بەرامبەرم وەستاوەو لەناو ساقۆكەیدا ختم بوە شتێكی ئەوتۆی لێ بەدی ناكەم هانی ئەوەم بدات لە شوێنێك دابنیشم، یانیش بە تەواوەتی ماڵەكە بەجێ بێڵم.. هەرچەند جارێ سەیریشی دەكەم بزەیەكی دێتێ، ئەڵبەتە منیش سەیری هەموو لایەك دەكەم چونكە نەرمە شێوانێك دایگرتووم، بە تایبەتیش لەوەتی خۆم بەرامبەر ئەم كابرایە دیوە، سەیرێكی لای ڕاستم دەكەم، بەڵام هێندە ناخایێنێ سەرلەنوێ تەماشای ئەو دەكەمەوە، كە تەماشای لای چەپیشم دەكەم دیسان هەروا، كە تەماشای زەویش دەكەم بە هەمان شێوە، هەر هەمان حاڵیش كە سەیری بنمیچەكە دەكەم، یان ناخی خۆم.

ئەو بۆتە وێستگایەكی چاوان لە نێوان هەردووكیاندا، ئەو بە خەندەكەی كە شتێك لە تاوێكی من دادەماڵێنێ مەودایەك دەبڕێ كە هی من نیە! بەڵكو هی خۆیەتی.. ئەویش بە هۆی ئەو دوو چاوانەم كە خۆیان دەدەنە دەست هەڵكشانی ئەو لە ژێر ئەو ڕووناكیە نزمەی شوێنەكەدا.. منیش نامەوێ بە شكستێكی تەم و مژاویەوە سنوورێك بۆ هەڵكشانەكەی ئەو دابنێم، وەك ئەوەی منیش بە دوای ئەودا بۆ دووریەكی بڵند پەلكێش بكرێم كە بە دوو بیلبیلەی بەهێز سەیری جووڵانەوەی نەرمی زەوی دەكەم كە





خۆی تەسلیم بە با- کردوە تا یاری پێ بکات و قاقای پێکەنین دابەش بکات، خۆی لێ دەبوێرم.. یەخەی کراسەکەم دادەخەم و کە پێی هاتوومە ئەم ماڵە، زیاتر پێیەکانم لەناو پێڵاوەکانم توند دەکەم کە بە سۆلانی لە پێم کردوون، لەم ئێوارەی ئەم بەهارە بە فیرۆ دراوەدا.

ئەو لێمەوە نزیکە.. واتە کابرای ختم بوو لەناو ساقۆکەیدا.. ئەزیش بە خۆم و کراسی یەخە ئاوەڵام و پانتۆڵی سەرچۆك ئاوساوم، پێڵاوەکانیشم کە خۆیان و قوماشە بەهاریەکەیان تەڕ بووینە. لە نزیکی دەرگاکەوەم.

هیچی دەربارەی ئەو شتانە لێ ناپرسم کە لەم دیدەنیە بێهودەیەدا سەری کردۆتە سەرمەوە. دەچمە دەرەوە، تەنانەت بێ ئەوەی ڕوخسەتیشی لێ بخوازم- بەرەو ئەو مەودایە دەڕۆم کە لە ناو تیشکە پرتەقاڵیەکەی گڵۆپی سەرجادەکە نوقم بوە کە بە نیوەیی لە نێوان باخچەی پێشەوەی ماڵەکەم و باخچەی ئەم ماڵەدا دابەش کراوە. سەرلەنوێ سەلام لە سێ بنە گوڵەکە دەکەم و خواحافیزیشیان لێ دەکەم: "بەخێر بمێنێ" پاشان ئاوڕ لە شتڵە بیبەرە پووتەکە دەدەمەوەو دەڵێم:

"هیوای خەوێکی خۆشم بۆ بخوازە" ئەویش دەڵێ:

"لە چارەت نەنووسراوە ئەمشەو بخەویت" دەپرسم:

"لەبەر چی؟"

شتڵە بیبەرەکە بە پێکەنینەوە پێم دەڵێ:

"لەبەر ئەوەی خۆت دەکوژی!"منیش پێدەکەنم:

"مەگەر نابینی خۆم کوشتوەو بڕاوەتەوە؟"

بەلام هێشتا کابرای ساقۆ لەبەرم لێ نزیکە، منیش هەر نزیکی دەرگاکەم پێویستە پاساوێکی سووك بێنمەوە بۆ ئەوەی دەربچم، بێ ئەوەی لێی بپرسم ئەم شتە بێهوودانە چی بوون لەم دیدارەدا نارەحەتیان کردم بەلام وەك ئەوەی کابرا هەست بە ئارەزووی دەرچوونی من بکا دەڵێت:

-مەم.. ناچار نیت بمێنیتەوە..!

ئەودەمە دەستی ڕاستم بەرز دەکەمەوەو بۆ تەوقە بۆی درێژ دەکەم و بە شپرزەییەکەوە دەڵێم:

"بە دیدەنیت خۆشحاڵ بووم". کابرای لەناو ساقۆکەیدا ختم بووش دەستی ڕاستەی لە گیرفانی دەردێنێ و تەوقەم لەگەڵ دەکات، من ڕادەچڵەکم.. چونکە ئەو دەستەی بۆم درێژ دەکات لە گۆشت نیە، بەڵکو لە باڵێکی گچکە دەچێت کە لە قەوارەی دەستێك دەکا کە بە پەڕی سپی داپۆشرابێ.

**سەرچاوە:** ڕۆمانی "پەڕ"، نووسینی سەلیم بەرەکات، وەرگێڕانی: جەوهەر کرمانج، چاپی یەکەم- ساڵی ٢٠٠١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

# مێژووی دوو دەوڵەتی دۆشتیك باز و هەزبانی

**پێشدەستی:**

سوپاسی زۆر بۆ پەروەردگارێکی وابێ کە لەسەر هەموو شاهەنشاو ئافەریدەیەکی فەرماندەیەکی بێ پرسیارە، هونەرمەندێکی وا بەرزە کە وریایی و تێگەیشتنی خستۆتە نێو کەللەی ئادەمیزادانەوە تا بە هۆی تێکۆشان و زانیاری ببنە نموونەی دەستەڵات و توانایی پەروەردگار.

بۆ نموونەی پێشەوەری و هونەرمەندێتی یەزدان ئەوەندە بەسە کە لەناو سێ پەردەی تاریك و تنوکدا لە تنۆکە ئاوێکی کیمیاوی چ دەورێکی یەکتاو چ گەوهەرێکی هەتیوی بێهاوتای لە مانگ و ڕۆژ جوانتری لە تیشکی ڕووناکی زانایی خۆی هێناوەتە دیی و بە هەزاران جۆرە خشڵی جوانی و نازداری و خوو و ڕەوشتی چاك و گەورەیی و ئازایی و جوامێری و.. ی ڕازاندۆتەوە.

بەندەی بێدەستەڵات کە لە مێژە بۆ گردکردنەوەی شوێنەواریی مێژوویی کوردان بەناو هەموو گۆشەو قوژبنێکی گێتی و بە تایبەتی کوردستانیدا گەڕاوم وە بە هەموو هێزو توانایەکی خۆمەوە بە دڵ و گیان لە پەلوپۆ کۆشەوەدا بووم تا بە پشتیوانی خودای تاك و تەنها لە سەرەتای ڕۆژێکیەوە کە مێژوو نوسراوەتەوە تا ئەمڕۆ ئەوەی کە وەدەستم کەوتوە کردومەتە کۆمەڵێکی چەند هەزار لاپەڕەیی و ناویم ناوە گەوهەری یەکانە، بەڵام کە لە لایەن ئەرکی چاپییەوە سەرنجم دایە وا دەرکەوت کە یەکجار چاپکردنی ئەو کۆمەڵە گەورەیە ئەرکێکی گەورەو قورسی هەیە و پێداویستی پوول و دراوێکی زۆرەو ئەویش لەم ڕۆژەیدا کە ئێمە لە ڕەواندزی لە پەلوپۆ کەوتووین و پەرێشانین هەڵناسوڕێ، جا لە ڕووی ناچارییەوە پارچە پارچە بڵاوی دەکەمەوە بەو چەشنە هەموو کەسێکیش دەتوانێ بیکڕێ و هیچ کەسیش لە خوێندنەوەیدا دڵگیر نابێت.

ئەو پارچەیەم کردە دوو بەند یەکەمینیان باسی چلۆنی پادشاو فەرمانڕەوایانی دۆشتیك دەگێڕێتەوە کە لە (دیاربەکر) و (ئەرگیش) و (بتلیس) و جەزیرەو موسڵدا دەستەڵاتدار بوون.

بەندی دوەمین لە بابەت ژیان و فەرمانداری پادشایەتی هەزبانی دەدوێ کە لە (ئاردەوێل) و (تەورێز) و (مەراغە) و هەموو پارچەکانی تری ئاوربایەگانیدا فەرمانڕەواییان کردوە و ناویشم نا (پێشکەوتن)ی ڕەگەزی کوردان و فەرمانڕەوایی دوو بنەماڵە و ئازادییان.

**دەوڵەتی هەزبانی لە ئاوربایەگاندا**

لەساڵی ٣١٠ تا ٥١١ ھ.

کە ئاوربایەگان کەوتە ژێردەستی عەباسیەکانەوە عایلەی فرخ شا لە حوکمداری دەستیان کورت بوو کەوتنە ژێر ئەمری عەباسیانەوە ئیبراهیم کوڕی محەمەد کوڕی بیژەن کوڕی ڕۆستەم کوڕی فەزلون تا زەمانی مەهدی کەوتە سەروکاری حکومەت و ڕەشیدی کوڕی کردە والی ئاوربایەگان، لە ساڵی ١٦٤دا ڕەشید ئیبراهیمی کردە نەدیم لە حوکمداری عەزل کرد کە ڕەشید بوو بە خەلیفە ئیبراهیمی لەگەڵ خۆی بردە بەغداو کردیە هەمەکارەی خۆی لە پاش دوو ساڵان خستیە وەزارەتەوە لەوێشدا زۆر بڵند بوو هەموو ئومورێکی هارون ئەلڕەشیدی خستە ژێر پەنجەوە کە ڕەشید مرد ئیبراهیم لە بەغداوە بۆ ئاوربایەگان هەڵات لە قەڵای (جران) لە کونەلا گیان (لاجان)دا خۆی گرتەوەو کچێکی ئەمیری موتا ئاوی هێنا لەو کچە کوڕێکی بوو ناوی لێنا (دیسام) ئەو کوڕە بە تەربیەیەکی شازادانە بەخێو کرا بە هەموو جۆرە ئاداب و حوکمدارێك مەشقی پێ دەکرا لە ساڵی ٢٨٨ ھ دا یوسف ساج لە شارەزوورەوە بەر بە ئاوربایەگان هجومی کرد دیسام لەنێو هەموو کوردستاندا ناوی کردبوو هەموو کەسێك بۆ تەدبیر دەهاتنە کنی و ئومەراو حوکمدارانی نزیکی مشورەتیان پێدەکرد یوسف ساج موحتاج بوو لەگەڵ دیسام ڕێك کەوێت، پیاوی نارده کنی و لەگەڵ خۆی ڕێك خست ئەو ساڵەشی گەلێك بە بەڵاو نەخۆش بوو چاوقوڵکە و مردن ئەوەندە بوو لاشەی پیاوان سەگ نەیدەخوارد دیسام بە گەلێك شروتان جوابی داوە یوسف بە زۆری کردو مومکین نەبوو بە بێ دی سام ڕوو لەو جێگایانە بکا، لە ساڵی ٢٩٦دا لەگەڵ دیسام لەمباحەسەدا بوو هەتا لەسەر کە هەموو

ئموری لەشکری لە دەست دیسام دا بێ ریك کەوتن و بە کۆمەلە روی کردە ئاوربایەگان دیسام لەگەڵ کوردانی مخابەرە کرد هەر لە لایە گیانەوە تاك دەگاتە دەریای قەزوین تەواوی کوردستانی ئاوربایەگان لەگەڵ دیسام ریك کەوتن، دیسام بێ ئەزیەت ئاوربایەگانی خستەژیر حوکمەوە تاکو سالی ٣٠٥ ھ لەگەڵ یوسف بە یەکیەتی حوکمداری ئاوربایەگان بوون و لەو مودەتەدا تەواوی ئەهلی کردە تەرەفداری خۆی هەر چیەکی بوو هەر دیسام بوو. لە سالی ٣٠٤دا یوسف لە دەستکەوت کەس نەدەچوە کنی. لە خەلافەتی موقتەدیردا (مونس) نیو نۆکەری یوسف ساج دەسیسەیەکی دامەزراند بە تەشویقی موقتەدیر خەلیفەی بە رۆحی هەموو ئەهالی ئاوربایەگانی بۆ لای خۆی کیشابوو کوردستانی ئاوربایەگان رووی لە پشیوی کردو جوڵانەوە. لە سالێ ٣٠٥دا (سبك) پیای یوسف زۆری لە مونس کرد ئەو جیگایەی خستە دەست خۆی کوردستان ئەوەندەیە روی لە تیکچوون کرد تا سالی ٣١٠ ھ. کوردستان وەکو گیژەلوکەی لی هات هەر لەو سالەدا دیسام فکری خۆی خرکردەوە بە هیزی خۆی تەکانیدا هونەری لە هەموان رفاندو بە گورجی ئەوانی هەموو دەربەدەر کردن خۆی خستە مەیدانەوە سەری هەموو سەر رەقانی نەرم کردو دەستی هەموو دەست دریژانی بری.

## ئیستقلالی کوردستانی ئاوربایەگان

دیسام ئالای پیکەتای لە کوردستاندا بەرزکرد، یوسف لەنیو گیانیدا دەژیا، هەموو ئومور هەر ئەو بوو، یوسف لە خۆی گەیشتبوو بە جاریکی دەستی لە هەموو ئوموریکی بەردا هەرچۆنیکی کە دیسام رازی بوایە یوسف دەمی نەدەکردەوە دیسام گۆشەو قولینچکیکی کوردستان نەما نەیگریت و لەشکری بە قوەت و پیاوانی دلاوەری لەسەر دادەنیت، دونیای ئەمین کردەوەو هەمو ئەهالی هیناوە ژیر حوکمی خۆیەوە. لە سالی ٣١٦ ھ دا یوسف مرد، دیسام بێ رەقیب بەرامبەری بێ هاوال ماوە دەستی بە تەشکیلاتی لەشکرو مەئموران کرد هەر کەسیکی لە خۆی نزیك و لەسەر مەزهەب و میللەتی خۆی بوو دایدەناو بە جاریك بەغدای نەناسی بە تەنها، ئالای کوردسانی بلند کرد ئارەدویل "آردوبیل"ی کردە پایتەخت و دەستی کرد بە ریکوپیکی لەشکرو مەملەکەتداری و رەعیەت پەروەری، دەستی عەدالەتی کردەوەو دەرگای زولم و تەعەدای داخست، هەر کەسیکی بۆنی زولمی بهاتبایە بە جەزای خۆی دەگەیاند، هەر چوار کەناری ئاردەویلی کردە قەڵاو دیوارو خەندەقیکی قولی لە دەرەوەی دیوارەکەی کولی و پری کرد لە ئاو، هەرچیەکی کە بۆ لەشکر لازم بوو ریکی خست، هەموو سەردارو سپهدارو مرزبانانی لە کوردان دانا چونکو لە پیشدا هیندیك لە بیگانان تیکەل بە لەشکری ببوو هەمووی دەرکردن بیجگە لە هیندیك دەیلمی نەهیشتەوە لە هەر جیگایەکی کە کەمیك ترسدار بوو قەڵای لی دروست کردو گەورەیەکی بە لەشکرەوە ناردە سەری، بۆ تەماشاکردن و ریکخستنی شارو قەڵاو رەعیەت و لەشکری بە مودەتیکی کەم بە نەفسی خۆی هەموو ئاوربایەکان گەراو ناوی خۆی نا شا، لەو سەفەرەدا نۆکەریکی خۆی کە بە (وشمگیر کوری



زیاد) مەشهور بوو بە درزیەوە زۆر کەسی خستە دەست کە لە هەقی دیسام شادا پیسێکی بکەن و فەسادێکی بەرپا کەن بە بەهانەی ئەمەوە کە دیسام شا ئەشعەری مەزهەبەو شمگیرو ئەوانەی کە لەگەڵی ڕێککەوتن خارجی مەزهەب بوون، تەعەصوبی ئاینی و فیتنەی مەزهەبیان خستە پێشەوە. دیسام شا بە زوویی گەڕاوە ئەو ئاورەی کوژاندەوە وشمگیر لە دیسام شا ڕزگار بوو و چوە ڕاجیس، گەلێکی زەوی و زار خستە دەست و تەپڵی حوکمداری خۆی لە ڕاجیس لێدا ئەو بزوتنەوەی وشمگیر بوو بە ئاگادارییەکی چاك بۆ دیسام لەوەش گەیشت کە مەیدان نەدات بەو جۆرە کەسانە، حاکم و قازی و سەرهەنگ مەرزەبانی لە هاوفیکرانی خۆی دانانە سەر کارو بە دادو ڕەعیەت پەروەری دەستی بە حوکمداری کرد، لە ساڵی ٣٢٦ ھ دا (سبکرەی) بێژراوی پیاوی یوسف ساج دووبارە هەوای شۆڕشی کەوتەوە مێشکییەوەو ناوی خارجی (باطنی) کردە ئالەتگەلێکی کورد لەسەر گرد بوونەوە تەماعێکی زۆری لە ڕێگای دینەوە خستە پێش بە درزیەوە قوەتێکی زۆری پەیداکرد تا فرسەتی دەست کەوت لەگەڵ ئەو هێزە پەلاماری بۆ گەلێك قەڵاو جێگایانی دیسام شا برد لەشکری ئەو جێگایانەشی لەگەڵ کەوت بەبێ ئەزیەت زۆر جێگایانی گرت.
دیسام شا هەرچەند کە بۆ میلەت کۆشا فایدەی نەبەخشی چونکو حەزی نەدەکرد کورد لەگەڵ کورد بە شەڕ بدا ئەو جارە کە بە ناچاری لەشکرێکی زۆری خڕکردەوە کە بچێتە پێش (سبکرەی) لە ناکاو لەشکری سبکرەیی دەورەی ئاردەویلی دا، دیسام شا پیادەی لە دەروازەی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ دەرخست پشتی سبکرەی گرت، لە پاش کوشتارو خوێنڕشتنێکی زۆر سبکرەی هەڵات ڕووی کردە موکران، موقران (مکریان) پەنای بردە بەر ئەمیری دواله (میان دو ئاو) ئەویش پەنای دا لەشکرێکی تەواوی بۆ گرد کردەوە پێکەوە چوونە سەر دیسام شا لە پاش گەلێك کوشتار دیسام توانای ڕاوەستانی نەما چونکو تەواوی کوردەواری کەوتنە لای دوژمنیەوە بە ناچاریی هەڵات چوو بۆ ڕاجیس (تاران) پەنای بردە بەر وشمگیر کە لە پێشدا باسی کرا کە حوکمداری ڕاجیس بوو ئەویش پەنای داو گەلێکی دڵخۆشی داوە بۆ کۆمەکی بە شەرتێك لێ قبووڵ کرد کە لە ژێر فەرمانی وشمگیردا بکرێت، دیسام شا لەبەر ژیانی هاتووی لێقبوڵ کرد لەگەڵ وشمگیر شەرتنامەیان مۆرکرد: کە هەر ساڵەی دە هەزار دینار بداتە ڕاجیس و ئەویش لە هەموو وەختێکی دا لەشکری بداتێ و کۆمەکی بکا، لەسەر ئەوە لەشکرێکی زۆری دا بە دیسام شا سبکرەی کە بیستی دیسام بە قوەتەوە گەڕاوەو شەرتنامەی لەگەڵ وشمگیر مۆر کردو بێجگە لە هەڵاتن چارەیەکی نەما، ڕووی خۆی کردە وان و ئەرگێش لەو چیایانەدا هێندێك ئەرمەنی عاصی ببوون دەستیان کرد بە ڕاو ڕووتی ئەرمەنیان لەگەڵ دەست و پێوەندی خۆی ڕوویان کردە (زۆزان)، دەستەی ئەرمەنیان لێیان وەخۆ کەوتن دەستیان کرد بە کوشتاریان لە پاش گەلێك یەکترکوشتن گەلێك پیاوانی سبکرەی و هاوالانی مردن چەند نۆکەرێکی پەرێشانی لە دەست دا، لە ڕەزالەتێکی زۆر پیسدا خۆی گەیاندە کن قەڵای ترم (تەر گەوەر) کە (سان) کوڕی سبکرەی لە تەرەف دیسام شاوە حاکمی ئەوێ بوو ئەویش خاوەندی لێکرد لەگەڵ قوەتێکی زۆر چوونە سەر قەڵای (ترم) میلەتی کوردان کە زانیان دیسام شا گەراوە سەر تەخت لە سبکرەی وە خربوون لنگیاندانی و شکاندیانن، سان و سبکرەی خۆیان لە پیش ڕانەگرتن، هەر بە کوشتار هەلیان برین هەتا لە خاکی ئاوربایەگانیان بەر بە عیراق ئاواکردن سان پەنای بۆ ناسر ئەلدەولەی حەمدانی موسل بردو هیندیك پیاوانیشی چوونە بەغدا پەنایان بۆ خەلیفە برد. ناسر ئەلدەولە حسین کوری ئامۆزای لەشکریکی زۆری دایە: سام و سبکرەی بە قوەتیکی زۆرەوە چوونە سەر دیسام شا کە لە مەیدانی شەردا لیکیان دا نەیانتوانی لە بەرامبەری دیسام شادا ڕاوەستن بە شکاویی و پەریشانی گەرانەوە موسل. دیسام شا لەسەر پەیمانی وشمگیر پابەند ماوە حوکمداری هەموو ئاوربایەگانی لە دەست بوو لەشکرو قوەت و گەورەیی ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادی بوو.

یەکیك لە وزەرایانی دیسام شا کە ناوی (عەلی کوری جەعفەر) بوو لە دیسام شا دلگیر بوو هەڵات و چوە قەڵای ترم پەنای بردە بەر محەمەد کوری مسافیر کە یەکیك بوو لە ئومەرایانی دیسام شاو لە بنەماڵەی میرانی کوردان بوو لە تەرەف دیسام شاوە ئامری حکومەتی کوردان و ئەرمەنیان بوو لەو خاکیدا لەو دەمیدا: "هوزان و مەرزەبان" کە هەردووکیان کوری محەمەد بوون لە باوکیان عاسی بوون، تەواوی خاك و سەلتەنەت و ئەمارەتیان خستە دەست و باوکیان لە قەڵای ترم دا لە بەندێ کردو ئەو دوو برایانە پیکەوە لە هەموو لایەکەوە دەستیان بە سەرکیشی کردبوو، هەر چیکوو عەلی کوری جەعفەر پەنای بردە بەر مەرزەبان و دەستی بە فەسادیو تەشویشات کردو مەرزەبانی خستە سەر هەوەسی سەلتەنەتی ئاوربایەگان و بە هەزار فیلان تیی گەیاند.

**سەرچاوە:**

پیشکەوتن، میژووی دوو دەولەتی (دوشتیك باز، هەزبانی)ە، نوسینی حسین حزنی، چاپی دووەم، چاپخانەی کوردستان- هەولیر، لاپەرە (٣٨-٤٤).

# نائومێدی و دەسیسە

سەدری ئـەعزەمی پێشـووی والی سێواسـی ئەودەمـە مسـتەفا ڕەشید پاشا کە ناوبـانگی بـە (دیبلوماتلی) پـەیدا کردوە ناردرایـە کوردستانی شیمالی، لە دوای ئەجرای زوڵم و ئیستیبداد ڕووی لە جـەزیرە کـردو لـەوێوە چـوە سـەر (زاخـۆ) سـەرکردەیەکی پاشـای ڕەواندز شاری بە دەستەوە نەدا، لـە دوای موخابـەرەو هـاوار لـە ڕەواندز کردن تورك وەتەنگیان هێنا، ئەو سەرکردە کوردە غیرەتی هەڵنەگرت شار بە دەست تورکەوە بداو ڕوو بە ڕوبار لە پەنجەرەوە خۆی هاوێژتە خوارەوە خنکا، لە دوای ئـەو تـورك زاخۆیان گرت، لەوێوە مستەفا ڕەشید پاشا ڕوو بە ئاکرە چوو، (پیربـال چاوەش) کە سـەرهەنگی لەشـکری سـۆران بـوو لـە قـەڵادا بـوو بەرامبـەری ڕاوەستا، تورك دەورەیاندا و دەستیان بە دیوار سمین کرد، پیربال چاوەش بە شەڕ نەیهێشت دیواری لەسەر کون کرێ‌و سێ مانگ خۆی ڕاگـرت، زێبـاری و خێڵـی ئـاکرە خیانـەتیان کـرد، ئـەویش ناچار بوو بە شەو قەڵای بەرداو ڕوو بە ڕەواندز هـەڵات. حکومـەتی ئاستانە ئەمری دابوو بە والی دیاربەکرو بەغداو موسڵ کە یاریدەی مستەفا ڕەشـید پاشا بـدەن و لـە سـیواس و مـوش و بـەتلیس و ئەرزەڕۆمیشەوە عەسکەر بۆ دیبلۆماتلی چوو، بیر ئەقداریش بـە لەشکری موسڵەوە چوە کنی و لە ئاکرەوە ڕوو بە حەریر لـە زێ دەرباز بوو، میر قەڵای ڕەواندزو ڕێگایانی بە سوپا توند کردو لە ڕەوانـدزەوە بـە لەشـکرێکی ٤٠٠٠٠ کەسـییەوە چـوە دەشـتی (حـەریر) و بەلـەز قاقـەزێکی بـۆ محەمـەد شـای قاجـار نـارد کـە یارمەتی بکات، میر لە ژێر فەرمانی سەرهەنگ ئەحمەد بەگی برای خۆیـدا لەشکری نـاردە پێش ڕەشید پاشاو لـە سـەر زێ شـەڕێکی خوێناویـان کـردو زۆر کوشـتار کـرا، بـە ڕاستی کوردەکـان پڵنگانـە شـەڕیان کـردو بە گەرمـە هەڵمـەتیان دەبـردە سـەر دوژمنیان، بـەڵام چونکی ژێر پایەی ئیش لە دەست مەلاو فەقێیەکاندا کلۆر کرابوو شـەڕ لەگەڵ ڕۆمیاندا بێ سـوود بـوو، مادامـە مـیری گـەورە بـەبێ فتـوای مـەلاکان کـاری نـەدەکرد!، ئـەو ڕۆژە هـەتا ئێـوارە تـۆپ و تفەنگ لە هەردوو لاوە کاری دەکرد، بە شەویش هەر پایەدار بوو.

مستەفا ڕەشـید پاشـا کـە لـە پێشـدا تەفـەکوری کردبـوو بـەر ئاوەژوویداو ناچار بوو بە شـەو پاشـەوپاش بگەڕێتـەوە، بەهـەر جۆرێك بوو لە زێ پەڕیەوەو ڕوو بە موسڵ ڕۆیشت وهـەڵات، تاڵان و ئەسـپابێکی زۆر کەوتـە دەسـت کوردەکـان و گەڕانـەوە حـەریر، مستەفا ڕەشید پاشا کە گەیشتە موسڵ فەرمانێکی ساختەی بۆ مەلا محەمـەدی خـەتێ و قاقـەزێکی پـڕ لـە ئایـەت و حـەدیس کـە ئالەتی دەستی تورك بوو بۆ میللەتی کورد کوشتن بەکاریان بردو بۆ میری گـەورەیان نـارد کـە بیخەڵـەتێنن، مـەلای خـەتێ چونکـە پەروەرشی دەستی داود پاشای گورجی زادەی والی بەغدا بوو لـەو جۆرە مەنشورو فەرمانانە ئاگادار بوو، دەستبەجێ تەرویجی کردو فتـوای دا کە شـەڕ لەگەڵ سەلاتینی (ساتیر)ی ئالی عوسمـاندا بـۆ دین و تەڵاق و باوەڕی ڕەخنەی هەیە، دڵی کوردی هەژاری لە شەڕ خاو کردەوە، حاجی قادر کوڕی برایم ئاغای ئیشیك ئاسی میری گەورە بە زبانی خۆی بۆی گێڕامەوە کە: میر ئەحمەدی برای میری گەورە لەگەڵ مەلا محەمـەدی خـەتێ لـە مەجلیسا بە کێشە هاتن، ئەحمـەد بـەگ ڕووی لـە هـەموو لەشـکر کـردو گوتـی هـەر کـەس هەواداری شـەڕی ڕۆمی (عوسمانی)یانە بکەوێتە لای منەوە، هـەر کەس شەڕ ناکات بکەوێتە لای مەلای خەتێوە، سەرهەنگ و لەشکر هـەموو بـە جارێك کەوتنـە پشـت ئەحمـەد بـەگ و چـەند فەقێیـەك لەلای مەلاو میری گەورە مانەوە.

لەگەڵ ئەوەشا میر گەڕاوە ڕەواندزو لە هەموو لایەکەوە هێزی خۆی خڕکردەوە، ئەحمـەد بـەگ و سێ هـەزار کـەس (لـە حـەریر) مانـەوەو چاوەڕوانی دەم و گەڕانی دەوران بوون، مستەفا ڕەشـید پاشا لـە موسـڵ لەشـکری موسـڵ و بـەغداو دیاربـەکرو سیواسـی هەڵگرت و لە ڕێگای ئاکرەوە ڕوو بە شیروان و مزوری بۆ چوونـە سـەر ڕەوانـدز ئـاژۆتی، بـایز بـەگی (باپشـتی) کـە چـەند سـاڵ لەوەپێش چووبوە ئەستەمبوڵ بە ڕابەری لە گەڵی چوە ڕەواندزو بەوەوە موخابەرەی لە تەك کوردەکاندا دەکرد حافز عەلی پاشای والی بەغدایش بـە هـێزێکی زۆرەوە لـە بـەغدا دەرکـەوت و ڕوو بـە هـەولێر خۆشـی، مسـتەفا ڕەشـید پاشـا لـە ئـاکرە کـە دەرکـەوت فەرمانێکی هەڵبەستی بە عارەبی پڕ لە ئایـەت و حـەدیس بومـیر نـاردە ڕەوانـدز، بـە کورتـی ئەمـەی خـوارەوە تەرجەمەیـەتی: (بـە شەرت و عەهدو میساق و پەیمانی خولەفایانی ڕاشدین بێت کە لەگەڵ موسڵمانانندا کردویانە ئەمینت دەکەم کە هـەر شتێکی ئێوە پێتـان نـاخۆش بێـت لـە حـەقتانا ئیجراناکـەم و هیچ بـێ دڵـی و ناگوزارێکی لە ئێوە خۆش نەبێت لە ئێمەوە بۆ ئێوە ڕوو نادات، ئارەزوومان هەر ئەوەندەیە کە ئێوە بکەونە ژێر سێبەری (ظل الله) ئەمیر ئەلموئمینین کە زاتی ئەقدەسی شاهانەیە، ئەوجا لـە هـەموو بەڵاو موسیبەت ڕزگار دەبن و لە دونیاو ئاخیرەتدا بە ئاسودەیی و

کەیفخۆشی دەژین، شەرت و عەهدیکی خەلافەتی ئیسلامی کە لەگەڵ ئومەرایانی ئیسلامی کردوە ئەمنیش ئەو پەیمانەتان لەگەڵ گری دەدەم کە ئەمین بن و نەترسین، ئەمن بە شەفەقەت و عەدالەت ئیوە وەکو ئەولادی خۆم لەژێر بالی مەرحەمەتدا بەخیو دەکەم و بە نیشان و خەلات فەرمانی میری میراتی ئەمارەتی سۆرانتان بۆ تەسدیق دەکەم، هەرچیەکت بویَ و هەر پیویستییەکت رووبدا دەیدەم و لە هەموو تەنگانەیەکدا یارمەتیتان دەکەم و بەسەر دوژمنتاندا زال دەکەم، ئەوانەش لە دوای هاتنتان بۆ بابی عالی دەکەویتە ئیجرائاتەوە.

کە ئەو فەرمانە گەیشتە رەواندز میر هەموو سەرهەنگەکانی لەشکری کۆکردنەوەو مەلا محەمەدی خەتیَ خواستە حزور، لەشکرو ئەهالی بە جاریك گوتیان چونتان لە دوای نەبوونی ئیمەیە، مەلای خەتیَ هەستا خوتبەییەکی دوورو دریژی خویندەوە فتوایدا هەر کەسیك شەر لەگەڵ لەشکری عوسمانی بکا بەبیَ ئیمان دەمریَ و لە ژیانیا تەڵاقی دەکەویَ، ئەو خوتبەیە لەو رۆژەدا تەئسیری بەخشی و بوو بە مایەی بیَ هیز بوونی میرو ناچاری کرد کە خۆی تەسلیم بە تورك بکا هەروەکو کردی، لەولاوە رەشید پاشا نزیك بوەوە هەتا گەیشتە دەشتی (سۆران)، چادرو خەرگای هەلدا و دیسان قاقەزیکی بۆ میری گەورە و یەکیکیشی بۆ مەلا محەمەدی خەتیَ نارده رەواندز و تەئمیناتیکی زۆری دا بە میری گەورەو بە شەرەف و حەمیەتی خۆی دلی ئاسودە کردو دووبارە پەیمانی لە تەکیا گریَ دا کە حکومەتەکەی پی بداتەوەو بیکاتە میری میران و روتبەی پاشایەتیشی بۆ تازە بکاتەوە.

مەلا محەمەدی خەتیَ بریاری دا کە میری گەورە برواتە لای مستەفا رەشید پاشا میری گەورەو مەلا پەنهانی لەشکرو سەرهەنگەکانەوە موخابەرەیان لەگەڵ کرد، میر ئەحمەدی برای دەکاتە وەکیلی حکومەتەکەی و مەلاو چەند سواریك هەلدەگریَ و دەچیتە کن مستەفا رەشید پاشاو بە حورمەتەوە پیشوازی کرا، رەشید پاشا سوپاسی بۆ مەلای خەتیَ دەکاو پیی دەلیت بە شەرەف سویند بیَ بە شادی میر دەنیرمەوە سەر حوکمداری خۆی مەلا ئەسعەدی خەیلانی زادەو حاجی قادری ئیشك ئاغاسی زادە کە لە بابی خۆیان بیستویانە دەلین میر باری ٢٠٠ ئیستر دراوی دا بە رەشید پاشاو بەو جۆرە میر دەخالەتی بە رەشید پاشا کردو لە سەر پەیمانی رەشید پاشا خۆی تەسلیم کرد و ناردرا ئەستەمبول و عەفوی سولتان مەحمودی بۆ ئیصدار کردو لەسەر عەهدیکی پیی دابوو روتبەی میری میرانی و پاشایەتی بە فەرمانەوە بۆ ئەستاندو بۆ گەرانەوە بۆ رەواندز ئەمری بۆ وەرگرت، لەو دەمانەدا مستەفا رەشید پاشا مرد. دوژمنی مستەفا رەشید پاشا کە عەلی رەزا پاشای والی بەغدا بوو بە لەز وەڵامی دا بە ئاستانە ئەگەر میر محەمەد پاشا بگەریتەوە رەواندز عیراق لە دەست دەچیت، و ئیدارەی حکومەت و شیرازەی ئیش تیك دەچیت.

میر لەودەمەدا روو بە تەرەبزون لە ئاستانە دەرکەوتبوو، بابی عالی ئەمریدا بە والیەکان، لە تەرەبزون و یا سیواس بە شەو ئیعدام و گوم کرا، سبەینیَ مەلا عەزیزی موفتی رەواندز کە ئامۆزای پاشا بوو لەگەلی چووبوە ئاستانە، لە بازارا دیتی پۆستی خەزو دەرمەقوپان و تورمەی سەری میر لە دەست دەڵالدایە ئەوانیش بەلەز بۆ کوردستان دەچنەوە

## بەندی چوارەمین

## ( میر ئەحمەدی کوری مستەفا بەگ )

میر کە چوە ئەستەمبول میر ئەحمەدی کردە جینیشینی خۆی، کە مەلا عەزیزی موفتی و پیاوانی میر بە هەڵاتن گەرانەوە رەواندز سەربهوردیان بۆ سەرهەنگان گیراوە، میللەت کۆبوونەوە و میر ئەحمەدیان کردە میری رەواندز، میر ئەحمەد بە (میر ئەحمەدە لالە) ناوبانگی کردبوو، لە میر ئەحمەد گەورەتر سلیمان بەگی برای بوو، لەلای کاولوکان دادەنیشت، هەوای حوکمداری کەوتەسەر، شەویك لە گەورەی بازرگان حاجی ئەلیاس و لەسەرهەنگان عەبدوڵڵا سەرهەنگی ئاکۆیی و چەند پیاوی گەورەی رەواندز بە میوانداری بانگ کردە مالی خۆی، لە دوای نانخواردن دەرگای گالە داو گوتی میری رەواندز بۆ برا گەورەیە دەبیَ هەمووتان ریَ بدەن، ئەوان هەرچەند تەقەلایاندا بیَ فائیدە بوو، هەستان کە برۆن، دەرگایان بە بەستراوی دیت، لە سەربانی قەڵا جاریان کیشا دەورە دەوری میر سلیمان بەگە، میر ئەحمەد بە لەشکرەوە دەورەی قەڵایدا، لە دوای ٢ رۆژ شەرو کوشتار، سلیمان بەگ ئاڵای تەسلیمی هەلدا، میر ئەحمەد پیاوانی نارده ژوورەوە، (سلیمان بەگی ماویلی) دەچیتە پیشەوە کە سلیمان بگریت، سلیمان بەگ دەست بە خەنجەر بۆی دیت، لەودەمەدا پاشەوپاش لە سەربان بەردەبیتەوە، لە سەرەوە سلیمان بەگ بە گوللە دایدەگریَ، میر ئەحمەد پیاوانی ناردو گرتیان، عەبدوڵڵا سەرهەنگ و حاجی ئەلیاس و هەواڵانی گیران، بەڵام لە دواییدا عەبدوڵڵا سەرهەنگ بەبیَ گوناه کوژرا، ئەوانی دیکە بەربوون، بوك شازەمانی دایکی میر تکای بۆ سلیمان بەگ کردو رزگار بوو، بەڵام حەپس کرا، عەبدوڵڵا سەرهەنگ پیاویکی قارەمان بوو لە خزمەت میر محەمەدی دا زۆر پەرای کرد، قەڵای ئاکرەو جەزیرە ئەو گرتنی، بیکەپایەی لەشکری رەواندز زوو لە کوردی (ئاکۆیانی حارس ئاغا) بوو، کە کوژرا ٣ کوری بەجیهیشت، (برایم ئاغا، حەمەد ئاغای داود ئاغا) سەرۆکی شارەوانی رەواندز محەمەد عەلی ئاغا کە ئەمرۆ کە هەیە کوری برایم ئاغایە، کە عەبدوڵڵا سەرهەنگ

کوژرا عایلەو براکانی باریان کردو چوونە شنۆو لەگەڵ تەرەفدارانی سلێمان بەگ ڕێك کەوتن و لە تەك مەحمود بەگی کوڕی عوسمان بەگدا کە ئامۆزای میر ئەحمەد بوو بە هێزێکەوە چوونە سەر میر ئەحمەد، لە دوای شەڕو کوشتارێکی زۆر بە شکاوی ڕوو بە شنۆیە گەڕانەوە، ڕەسول پاشا کە لە ئامێدی گەڕاوە ڕەواندز، ناردی ئەو عایلەیەی بردەوەو هەردوو برایانی حەپس کردن، لە پاش ٢ ساڵان بەری دان ئەمڕۆکەش ئەو عایلەیە هەر دەستدرێژن، لە دوای میر محەمەد نێوانی سلێمان بەگ و میر ئەحمەد بە پشێوی ڕادەبوران، ئەحمەد پاشای بابان چوە سەرمەرگەو مەچوخەو ڕانیەو کۆیەی گرتن و خێڵی مانگوڕو چناران و خۆشناو و پیران و خەلەکان و بیتوێنی خستنە ژێر حوکمیەوە، شاری هەولێر بە دەستیەوە کەوتە دەست (محەمەد مەصرەفی)، ئاکرەو زاخۆ و دهۆك کەوتنە دەست ئیسماعیل پاشا، تەنها ئومێد لە دەسەت ڕەسول پاشادا ماوە، سەعید پاشای ئاکرە لەشکرێکی لە خێڵی زێبارو شیروان هەڵگرت و ڕوو بە ڕەواندز چوو، میللەتی بالەکیان لەشکریان دایەو چوونە (گەروی جەنگە) کە لە شیمالی ڕەواندزە، (گیان ئاویژ)یشیان گرت کە لەسەر ڕیی ڕەواندز و باپشتیان دایە، چونە خوار بۆ سەر ڕەواندز، لە لایەن میر ئەحمەدەوە دەست بە بەرامبەری کرا، لە دوو کۆنگرەی لە ڕۆژئاوای شارو ئیچ قەلاوە بە تۆپ ئاور بارانیان کردن و زۆر سوپاهی سەعید پاشایان کوشت، دەستە پیادەی ڕەواندز لە دوو قۆلەوە چوون و پشتی دوژمنیان گرت، سەعید پاشا شکاو هەڵات، میر ئەحمەد ٣ سال حوکمداری کرد، بەڵام لەبەر شۆرش لە حکومەتی خوی کامەران نەبوو، میر کە ڕۆژی جومعە بچوبایە مزگەوت لە دەروازەی سەرایەوە هەتا دەرگای مزگەوت ٢ ریز لەشکر رادەوەستان و زۆر سەرۆك و سەرهەنگ لە تەکیا سواردەبوون و لەنیو خۆیان دەگرت و دەیانبردە مزگەوت و دەگەرانەوە، میر ئەحمەدیش بەو دەستوورە ڕۆژی هەینی سواربوو گەیشتە سەر پردی خەرەند کە بە پردۆکەی مەلا ئەحمەدی مەلا سلیمان دەناسرێ، مەحمود بەگی کوری عوسمان بەگ کە سەربهوردی باب و باپیری کوترابوو تۆلەسەندنەوە لە ڕەواندز چاوەنۆری کەلین بوو لە مالی (الله بەگ) ناوو لە پشت پەنجەرەوە سیرەی تفەنگی گرتبوو، میر ئەحمەد کە گەیشتە نیو دەرگای پرد گوللەیەکی لە مورەی پشتی دا لە ئەسپی بەرداوە لەشکر دەورەی خانوی الله بەگیانداو چوونە ژوور، محەمەد بەگ ٦ی دیکەشی بریندار کرد ئینجا کوژرا، میر ئەحمەد کە زامدار بوو بردیانە مال و دەرمانیان کرد، سەرهەنگ کۆبوونەوەو لەشکریان سازکردو ئەمری بەگزادە کوشتنیان دا، سێ ڕۆژ لەنیو شاردا کوشتاریان لە بەگزادە کردن، ڕۆژی سێ ئەحمەد بەگ گیانی بە بەهەشت شادبوو، لە دوای ناشتنی ئەحمەد بەگ سەرهەنگەکان لەشکریان ناردە دەرەوەو هەر بەگزادەیەکیان دەستکەوت کوشتیان.

## ( سلیمان بەگ کوری مستەفا بەگ )

کە میر ئەحمەد مرد سەرهەنگ و گەورەی لەشکرو شار خربوونەوەو سلیمان بەگیان لە حەپس دەرخست و کردیانە میری سۆران، چەند ڕۆژیك رای نەبوارد، کە دەستی بە تۆلە ئەستاندنەوەو ئەزیەتدانی ژێردەستان کرد، پیاویکی زنجیرەوانی میر ئەحمەد هەبوو، گرتی و ئیعدامی کرد، کە لە حەپسدا ڕۆژیك زووتر بردوویتیە ژوورەوە، رقی ئەوەی لێ هەلگرتبوو، کە بوو بە میر یەکەمین جار ئەو پیاوە بیگوناهەی کوشت.

خەزینەی حکومەتی کیشایە مالی خۆی و تواندنیەوەو کردنیە سندە کە بۆ پاشەڕۆژی بەکاربیت.

سەرهەنگەکان کە تەماشای بزوتنەوەی سلیمان بەگیان کرد، شایانی میری نەبوو، چوونە کنی و پییان گوت کە دەبێ چاو لە گوناهانی پیشوو بپۆشیو لەگەڵ دراوی خەزینە خیانەت نەکەی چونکە ئەو هەردوو کانە بناغەی چەسپاندنی حوکمرانی تۆن سەرهەنگان، هەر چەند کۆشان، نەشیان، پیش بە سلیمان بەگ بگرن و چارەیان نەکرد، لە دوامیندا گرتیان و خستیانە حەپسەوە.

## حوکمداری بەگەڵ ( جمهوریەت )

میللەت کە سلیمان بەگیان حەپس کرد لە سەرهەنگەکان و گەورەکانی ڕەواندز کۆمەلیك خربوونەوە حکومەتەکەیان کردە (گەلی) و بەگەڵ ئیدارەیان دەستپیکردو لە تەك ڕەسول بەگدا بناغەی هاتوچویان دامەزراند، لەودەمەدا نیوانی سەعید پاشاو مەلا یەحیای مزوری تیکچوبوو و بەماڵ و منداڵەوە هەڵات و ڕوو بە بەغدا ڕۆیشت،، سەعید پاشا بنچەنگی لە فەسادی چۆل بوو لەتەك ڕەسول بەگدا موخابەرەی کرد بە معامەلەت ریك کەوتەوە، ڕەسول بەگ ئالەت و موهیمات و لەشکریکی کە هەی بوو ریکی خست و ئامیدی تەسلیم بە سەعید پاشا کرد، لە مانگی ڕەبیعی یەك سالی ١٢٦٠ لە ئامیدیەوە ڕوو بە ڕەواندز بزووت، کە نزیك ڕەواندز بوو، ئەهالی سەرهەنگ و لەشکر پیشوازیان کرد، دەورەی سەرهەنگەکان کە بەگەل حوکمرانیان دەکرد ٢ سال و ٢ مانگ بوو گەلیك چاکەیان بۆ میللەت هەبوو، داود ئاسودەگی و ئەمنیەت لە دەوری میری گەورە چاکتر نەبوایە کەمتر نەبوو، هەر دوژمنیکی بنەمالەی سۆران بوو بە زۆر پووچیان کردەوەو قەلای ڕەواندزو دەورەو پشتیان زۆر چاك بەخیو کردو لەگەڵ ڕەعیەت و لەشکریاندا گەلیك میهرەبان و دادرەس بوون لە دەوری ئەواندا

مەلای خەتێ لە ڕوو کەوتبوو و لەنێو میللەتدا ڕێزی نەمابوو، ناچار باری کردو چوە گوندی خەتێ کە لەنێو هەروتیدایە.

## ڕەسول پاشا کوڕی مستەفا بەگ

ڕەسول پاشا کە گەڕاوە ڕەواندز ٦٠٠ نەفەر لەشکری خۆی هەبوو، ١٠ تۆپ و باروت و جبەخانەیەکی زۆری لە تەکدا بوو، دەستی بە دامەزراندنەوەی حوکمداری کردەوە، لە دوای چەندێك بە قسەی مفسیدان یەکە خۆشەویست و ئازاو مودەبیری ئیش و سوپاکە (حەمەدی شیرین) بۆ بەهانەیەکی پڕوپووچی گرت و خنکاندی، زۆری پێ نەچوو لە سەرهەنگەکان (حەمەدی صوفی) ناوی گرت و هەردوو چاوی دەرهێناو کوێری کرد، لە دوای چەندێکی دیکە لە یەکە خۆشەویست و پیاوانی میر کە (میر شاتر)ی نێو بوو گرتی‌و لوس تالانی کرد.

بەو جۆرە ڕەسولّ پاشا سەرهەنگەکانی ئیشوکار گوزاری هەمووی ڕەنجیدەکردن و ئەزیەتی دان.

ڕەسول پاشا کە لە ئوموری خوی پەرژایە سەر کاری دەرەوە لەگەڵ ئەحمەد پاشای باباندا موخابەرەی کردو پیاوانی زانا لە نێوانی هەردوولادا هاتووچونیان کرد، لە دوایی پێکهاتن ڕەسول پاشا (فاتمە خان)ی خوشکی خۆی دا بە حسێن بەگی برای ئەحمەد پاشا، ئەوجا دۆستی و ئاشنایەتی بوو بە خزمایەتی، ئەحمەد پاشا خاکی دیرەو حەریری بەبێ شەڕ داوە بە ڕەسول پاشا.

ڕەسول پاشا لەگەڵ حوکمداری خۆی خەریك بوو بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لە بالەکیەکان کە یاریدەی سەعید پاشایاندا بوو، لەشکری سازکردو بەناوی ڕاو چوە گوندی بالەکیان، ئەهالی پێشوازیان کرد ڕەسول پاشا ئەمری دا هەرکەسێك دەستی تفەنگ بگرێ لە گوند دەرکەوێت، ئەهالی بێهۆش ئاگایان لە پاش و پێشی کارو کردەوەی خۆیان نەبوو، نێرینە لە ئاواییدا نەماو هەموو دەرکەوتن، ڕەسول پاشا پێی گوتن بۆ شارەزایی ڕێگا بکەونە پێش لەشکرەوە، بالەکیەکان بە گۆرانی و کەیف کەوتنە پێش هەتا لە گوند دوورکەوتنەوە، لەشکر دەورەیدان و شیلنگە تفەنگێکی کردنی و زۆریان لێ کوشتن و هی ماوە گیران دەست بەستە خستیاننە پێش سنگی ئەسپەوەو ڕوو بە گوند جڵەویان سوڕاندەوە، گوندی لوس تالان کردو گەڕاوە ڕەواندز لە دوای تالان و کوشتاری بالەکەیان، ڕەسول پاشا بۆ تۆڵە کردنەوە لە (سەلیم خان)ی سەرۆکی سەرچیا ٣٠٠ کەس شەڕکەری لە ژێر فەرمانی سەرکردەی جۆڵەمێرگی (مرادخان)دا نارده سەر قەڵای (کەڵەکین)، مرادخان بە شەڕ دەورەی قەڵای دا، لە تەك خۆیا نەردیوانی بردبوو بە دیواری قەڵایەوە نا، لەشکری سەرخستە سەرەوە، سەلیم خان ئاگادار نەبوو هەر هیندەی زانی دوژمنی گەیشتە سەری، دەست بە خەنجەر روو بەوان چوو، نەیانهیشت بگاتە پیشەوە بە تفەنگ کوشتیان و خەنجەرو تفەنگەکەیان بۆ رەسول پاشا نارد، عەلی بەگی کۆسە کە سەرکردەی میری خۆشناو بوو، لە پیشا ئەو بوو بە بۆنەی تەسلیم کردنی حەریری بە ئەحمەد پاشای بابان، لەلایەن ئەحمەد پاشاوە حاکمی حەریری کردبوو، رەسول پاشا ئەو رقەی لە دڵا بوو، سەرکردەی لەشکری خەیلانی نارده سەر میری کۆسە کە لە قەڵای (دیرە) دادەنیشت، بە شەو لەشکریان بردو قەڵایان گرت و میری کۆسەو چەند سەرکردیەك و چەند نۆکەریان لی کوشت و بە شادی گەرانەوە رەواندز، لە دوای ئەوە رەسول پاشا لە ژێر فەرمانی (قۆچاخلی)دا لەشکریکی نارده سەر محەمەد مەصرەفی حاکمی هەولیر کە لە دوای میری گەورە خیانەتی کردبوو و لەتەك رۆمیاندا ریك کەوتبوو، قۆچاخلی کە چوو لە شەرقی شیمالی قەڵای هەولیر توشی مەصرەفی بوو، لە دوای کەمیك شەر مەصرەفی بریندار کردو گەراوە رەواندز، (ئومور ئاغای باوە خەلە) لە خیلی زراری لە فتنەو شۆرش رانەدەوەستا، رەسول پاشا ناردیە سەری و لە دوای چەند شەریك کوشتیان، لە کوشتنی ئەحمەد بەگ (میر ئەحمەدە لالە)دا دوو ئامۆزای خۆی کە (ئۆمەر بەگ) و (ئاحنا بەگ) بوون دەستیان تیدابوو، لە ترسی رەسول پاشا بە مالەوە هەڵاتبوون و چووبوونە خاکی (مەرگەوەر) کە لە نزیك شنۆیە، رەسول پاشا چەند جاران پیاوی نارده سەریان کە بیان کوژن، بەڵام وەبەرنەکەوتن، بایز بەگی باپشتی چونکە لە دەورەی میری گەورەدا هەواداری رۆمیان بوو، چوبوە ئەستەمبول و لەگەڵ رەشید پاشادا گەرابوەوە، ئەو رقە هەر لە دلی رەسول پاشادا مابوو، ناردی لوس تالانی کرد، چونکە پیر بوو، نەیکوشت، بەڵام بە مال و مندال و کلفەتەوە بۆ هەولیری نەفی کرد، مولك و مالی بایز بەگ و ئاحنا بەگ و ئۆمەر بەگی زەوت کردن و دانیە پیاوانی خۆی. رەسول پاشا بەو جۆرە کولی دلی خۆی بە هەمواندا رشت و هەریەك لە ناحەزانی بە دەردو ئەزیەت گرفتار کرد، کە لەوانە ئاسودەبوو لەگەڵ لەشکر ریکخستن و رەعیەت نوازی و ئالەت و پیویست پیکەوەنان خەریك بوو و هەتا سالی ١٢٦٨ بە ئازادی و موستەقیلی حکومەتی سۆرانی ئیدارە کردو بە چاکی رایبوارد، لەو سالەدا حکومەتی عوسمانی لەشکریکی قورسی نارده عیراق و هەولیرو کەرکوك و ئاکرەو ئامیدی و زاخۆو دهۆکی پر لە عەسکەر کرد، خەڵاتی میری میرانی و روتبەی پاشایەتی لە لایەن نامیق پاشای والی بەغداوە بۆ رەسول پاشا ناردرا و لەسەر خاکی رەواندزو حەریرو شیروان و بالەك و برادۆست کرا بە میری میران و فەرمانی بۆ ناردرا، لە دوای چەندیك حکومەتی عوسمانی مەنشوریکیان بۆ رەسول پاشا نارد کە دەبێ سالی ٨٠٠٠٠ ریال بدات بە حکومەتی تورك، رەسول پاشا کە وردبوەوە تەماشای راست و چەپی ئموری خۆی کرد، ناچار بوو، کە ئەو دراوە بخاتە عەهدەوەو دەفعی شەر بکات هەتا هیزیك پەیدا دەکات، چەند

ساڵێك لەژێر ئەو قەیدەدا بوو، بەڵام ئاقچەیەك و پولێكی نەدا، نامیق پاشا قاقەزێكی بۆ نووسی و داوای دراوەكەی لێكرد، ڕەسوڵ پاشا بەهانەی گرت و نەیدا، ساڵی سێیەم دووبارە نامیق پاشا مەنشورو هەڕەشەیەكی بۆ نارد و داوای ٢٤٠٠٠٠ ریاڵی لێكرد، ڕەسوڵ پاشا لەزی لە كاركردو بە نەدان جوابی داوەو گوتی چۆن دراو ئەدا.

ساڵی ١٢٧٢ نامیق پاشا لەشكرێكی قورسی ناردە سەر ڕەسوڵ پاشاو ئەمری دا بە موسڵ و هەولێر كە بە لەشكرەوە یارمەتی بكەن، ئەو لەشكرە كە لە هەولێر دەركەوت ڕوو بە ڕەواندز چوو، لە دەشتی حەریر لەشكری ڕەسول پاشا پێشی پێ گرت و لە دوای شەڕو كوشتار قوەتی كوردی حەریرو دیرەو دووێنیان بەرداو چوونە ڕەواندز، ڕەسول پاشا دەورووپشتی ڕەواندزی توند كردن و گەروی گەلی عەلی بەگ و ڕێگای ڕەنگینەو كونەبەفرو كورەك و گەروی بیجانیان بە لەشكرو تۆپ توند كردن و سەنگەری تێدا دامەزراندن، ڕەسول پاشا ماڵ و منداڵ و خەزێنەو گرانباری لە ڕەواندز دەرخست و بە چەند سەرهەنگ و هێزەوە ناردنیە قەڵای (سیدەكان)، لەشكری نامیق پاشا لە سپیلك سەركەوت و هەموو خێڵی كوردی لەگەڵ خۆی بردبوو، كە گەیشتە چۆمی خەلیفان بە ڕابەری شارەزایانەوە لە كوێرە ڕێگایەكی كە لەشكری ڕەسول پاشا نەیان گرتبوو لەشكری ئاژۆت و ڕوو بە ڕەواندز ڕۆیشت، كە لە پیادە ڕێ سەركەوت لەشكری ڕەسول پاشا سەرسام مان، ڕەسول پاشا كە وای بیست میللەت و ئەهالی بانگ كردو گوتی من لە شار دەردەكەوم با كوشتار نەكەوێتە شارەوە، مادامە خێڵی كورد خیانەتیان كرد من شەڕ ناكەم وا ئێوەش بڕۆنە پێشوازی عەسكەری ڕۆم و بە مامەڵەت بیانهێننە نێو شارەوە، ڕەسول پاشاو دەستەو دائیرەی سواربوون و چوونە (سیدەكان)، لەتەك حكومەتی ئێرانا موخابەرەی كرد، لە ئەهالی ڕەواندز چەند گەورەیەك لەگەڵ نامیق پاشادا موخابارەیان كردو بە مامەڵەت ڕۆژی ١٥ جەمادی دوەم ١٢٧٢ ڕۆژی جومعەی دوای ئێوارە لەشكری ڕۆمی گەیشتە نێو ڕەواندز، چوون لەسەرسا خێوەتیان هەڵداو لەنێو شاردا دەستیان بە تەشكیلات كرد، (كەنعان پاشا) ناو توركێكیان كردە موتەصەریفی ڕەواندز و عەسكەرێكی زۆری لێ دانا، هەر لەو ساڵەدا تەلەگرافی بردە ڕەواندزو دائیرەی نفوس و گومرگ و ڕەدیف و مەئموران و مەكتەبێكی ڕەسمی ئیبتیدائیشی تێدا دامەزراندرا، ڕەسول پاشا كە گەیشتە سیدەكان لەتەك ئێرانا موخابەرەی كرد، وەلی عەهدی ئێران لە شنۆ جێگای نیشان دا، ڕەسول پاشاو دەستەو دائیرەو ماڵ و منداڵی چوونە شنۆ، حكومەتی ئێران بە موحتەرەمی ڕایگرت، ڕەسول پاشا هەتا ساڵی ١٢٧٧ لە شنۆ مایەوەو لە دواییدا لەگەڵ نامیق پاشای والی بەغدادا موخابەرەی كرد و بە وەعدو پەیمان لە شنۆ دەركەوت، ماڵ و عایلەی سەرهەنگ و دەستەو لەشكری ناردەوە ڕەواندز، بۆ خۆی و عایلەكەشی ڕوو بە كەركوك چوون، تەقیەدین پاشای موتەسەریفی كەركوك بە حورمەتەوە پێشوازی كردو لە گەڕەكی ئیمام قاسم دەستە خانووبەرەیەكی زۆر چاكی پێدا. ڕەسول پاشا كە عایلەكەی دامەزراند چوە بەغدا، نامیق پاشا لە دوای ئیحترام گرتنی، كردیە موتەسەریفی مەركەزی بەغدا، ڕەسول پاشا دوو ساڵ لەسەر ئەو وەزیفەیە مایەوە، لەو دەمەشدا ئەسعەد پاشای ئاكرە برایە بەغداو دەستبەسەر بوو، ساڵی ١٢٨١ نامیق پاشا بوو بە مشیری مابەین و چوە ئەستەمبوڵ و ڕەسول پاشاشی لەگەڵ خۆی برد، لە دوای ساڵێك ڕەسول پاشا كرا بە والی شاری (وان) و نزیك ١٠ ساڵان لە وان والی بوو، ساڵی ١٢٩٢ بوو بە والی ئەرزەڕۆم و لەوێ ژنی هێناو ماڵی ڕێكخست، ساڵی ١٢٩٤ بۆ شەڕی ڕووس ئیشتراكی عەسكەری ئەحمەد موختار پاشای كرد، ڕەسول پاشا ساڵی ١٢٩٨ لە ئەرزەڕۆم مرد، ئیحسان بەگ و چەند كوڕێكی دیكەی لە پاش بەجێ ما، لە ژنی ڕەواندزی كە (بوك رابی) خوشكی حاجی مستەفا ئاغای ڕەواندزی بوو ٣ كوڕی لەگەڵ كیژێكی بەجێهێشت و لە كەركوك مانەوە، كوڕی گەورەی ئەسعەد بەگ كە بابی عەبدوڵڵا موخلیص بەگ بوو كە ئەمڕۆ كە عەبدوڵڵا موخلیص بەگ لە هەولێرە، كوڕی ناوەنجی ناوی فەتاح بەگ بوو، كە بابی ئامینە خانی دایكی كەریم بەگی قایم مقامە، ئەمڕۆ كە ئامینە خان ماوە، كوڕی بچوكی ناوی ڕەشید بەگ بوو چوە ئەرزەڕۆم و لەوێ مرد.

لە موقابیل ئەرازی موڵكی ڕەسول پاشا حكومەتی عوسمانی ساڵی حەوت هەزارو پێنج سەد قوروشی بۆ ئەولادانی پاشا بریەوە.

ڕەسول پاشا پیاوێكی تیگەیشتوو زرنگ و ئازاو مودەبیرو وریا بوو و گەلیك پەرای بۆ كوردی سۆران كرد، بەڵام زەمانە نەیهیشت سەركەوێ، لە میری گەورە بە تۆڵەترو رق ئەستورتر بوو، لە پاش نەوەد سال ژیان بە ئامرزشی خودا شاد بوو، حكومەتی سۆران بەو ئینقرازی هات، رەواندز چەند سالیك موتەصەریف نشین بوو، لە دواییدا بۆ قایم مقام نشین، هەروەكو لە داهاتودا لیی دەدویین.

رەسول پاشا لە پاش میر محەمەد پاشای برای حەوت ساڵانی پادشایەتی كردوە، هەرچەندە توركەكان هەر سالەی داوای ٤٠٠٠ لیرە خەرجیان لی دەكرد، نەیدانێ. لە دواییدا لەشكریكی زۆری عوسمانی هاتە سەر لە پاش چەند لیكدانیكی چەندین جار لەشكری توركانی تیكشكاندو زیانیكی بیئەندازەی پیگەیاندن دیسان عوسمانیان مەلاكانیان لە ژیرەوە هانداو ئەوانیش دەهۆلیان بە ناوی ئایین و خەلافەتی ئیسلامیەوە لیدا، دەستیان بە چاو و راو و فتوای نارەوا كرد، رەسول پاشاش چاو و راوی مەلایەكان كاریكی وای لیكرد، دەستی لە شەر هەلگرت و رووی لە ئیران كرد، پینج سالان میوانی وەلیعەهد بوو و ریزیكی زۆری

گیرا، له دواییدا لەسەر تکای عوسمانیان و ئێران چوه (بەغدا)یە له نزیك مەیداندا لەناو ئەو خانوەیدا دانیشت کە چاپخانەی رۆژنامەی عێراقی له سەردەمی ئیحتلالدا تێدا بوو و له بەغدایەدا گەڕەکێکیشیان بە ناوی وی ناو (٥٠٠٠) قوروشیشیان هەموو مانگێکی له جیاتی داهاتی سامان (ملکە)ە کانی و (٥٠٠٠) قوروشیشیان جبیره بۆ بڕیەوه.

ڕەسول پاشا موتەصەریفی بەغدای کردوه له ١٢٧٢ی کۆچیدا بۆ هاوکاری شەڕی رووسان بە فەرمانداری چۆتە ئەرزەڕۆم و پایەی (ڕۆم ئیل بەگلەر بەگی) دراوەتێو دووباره بە ئەرزەڕۆمیدا له (١٩٧٥)ی کۆچیدا بۆ سەردانی خزم و کەسوکارەکانی هاتۆتەوە بەغدایەو ماوەیەکی تێدا ماوەتەوه، له دواییدا بە ڕێگای حیجازیدا چۆتە ئەستەمبووڵی و کرا بە والی ولاتی (وان) دوای سێ ساڵان بە ئارەزووی خۆی وازی له والیەتی هێناوه، رووی له ئەرزەڕۆم کرد هەرچەنده ڕەسول پاشا له خێزانی بەرایی ئەو چوار کوڕانەشی هەبوون:

١-ئەسعەد بەگ.

٢-فەتاح بەگ.

٣-ڕەشید بەگ.

٤-بارام بەگ.

سەرەڕای ئەوەش لەوێ خانەوادەی (وجنەزاده)کان پادشایان کرده زاوای خۆیان له خێزانی دوەمیشی کوڕێکی بوو ناوی نا (ئیحسان بەگ).

ڕەسوڵ پاشا لە یارمەتی شەڕی (٩٣)دا پایەی وەزارەتی فەخری دراوەتێ و لەوه بەولاوە ئیتر هەر له ئەرزەڕۆم دانیشت و له ساڵی (١٣٠١)ی کۆچیدا هەر لەوێدا کۆچی دوایی کردوه.

ئەسعەد بەگ کوڕە هەرە گەورەکەی ڕەسول پاشا خوێندەوارییەکی پێشکەوتوو و ڕۆشنبیرێکی پایەبەرز بوه، داخەکەم له (١٢٧٥)دا له زێی بەغدایەدا خنکاوە له لای شێخ عومەری سەهرەوەردی شاردراوەتەوەو تەنها عەبدوڵلا موخلیص بەگی کوڕی بە یادگار بەجێهێشتوه.

فەتاح بەگ کوڕی دوەمی ڕەسول پاشا له ١٢٤٦ کۆچیدا له ڕەواندزێدا له دایك بوەو له بەغدایەدا له لای موفتی زەهاوی و مامۆستایانی تایبەتی خوێندەوارییەکی بەرزی دەست خستوه و له نووسینی گشت شێوە خەتێکیدا خۆشنووسێکی بێهاوتا بوەو شارەزاییەکی تەواویشی بەسەر زانستی مێژوو و ئەردناسی (جوغرافیا) و وێنەگەرێتی و پزیشکێتی (طبابة) کوردەواری و نیشانە ئەنگێویدا هەبوه، دیوانێکی زۆر بەرزیشی بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی هەیە.

فەتاح بەگ قائیمقامیەتی (سنجار) و (چەلدر) و کەیخودایەتی (وان) و (ئەرزەڕۆم) و سەردارێتی (کومیسیونی سرکی) پاریس کە له ئەیالەتی (شارەزووری)دا دامەزرابوو کردوه، له دواییدا بوو بە قائیمقامی (صەلاحیە)، (خانەقین)، (سوق الشیوخ) و (سماوە) وە کراویشەتە سەرۆکی وێکەوتن (تحقیقات) و سەرداری کۆمەڵەی باربووی قاتی و قڕی لێدراوەکانی (ئەنەدۆڵ) و سەرۆکی دادگای سزای (بەصرا) و بگێر (مدیر)ی دەفتەری خاقانی بەغداو بەڕێوەبەری زانیاری بەغدایەوە له جڤات (مجلس)ی گەورەشدا ئەندامەتی کردوه، وە له چاخی پادشایەتی باوکیدا کەیخوداو نووسەری فارسی بوە، له دواییدا لەبەر نەخۆشی دەچێتە ئەستەمبووڵ و له (١٣٠٥)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردوه.

(ڕەشید بەگ) کوڕی سێیەمی ڕەسول پاشا لە ١٢٤٨ی کۆچیدا له ڕەواندز هاتۆتە مەیدانی ژیانەوه، هەرچەنده خوێندەوارێتێکی زۆر بەرزیشی بوه له خزمەتی باوکی خۆی بەدەر هیچ جۆره فەرمانێکی تری نەدیتوه، ئەویش له ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا له ئەرزەڕۆمیدا کۆچی دوایی کردوه.

بارام بەگی کوڕی چوارەمینی ڕەسول پاشا له (١٢٥٠)ی کۆچیدا بە ڕەواندز له دایك بوه وە له گەڵ زانستی و زمانانداشارەزا بوه، داخم ناچێ کە سەربهوردی بە تەواویو بەرواری کۆچی دوایشی دەست نەکەوت.

ئیحسان بەگ کوڕی پێنجەمینی ڕەسول پاشا له پاش ئەوەی کە له خوێندەوارێتیدا بەهرەیەکی زۆرو پوختی وەبەرکەوت، کرا بە ئەندامی ئیستئناف و مەجلیسی ئیدارەو گەلێك فەرمانانی گرنگی دیتوەو ماوەیەکیش مدیری ڕێگای ئاسنی نێوانی شام و حیجاز بوه، لەسەر تێچاندنی شۆفاران له (١٣١٨)دا بردیانە ئەستەمبولی وە تا سەردەمی مەشروتیەت بەناوی دەربەدەری لەوێدا ڕاگیراوه له دوای شەڕی پێشوو هەر لەوێدا کۆچی دوایی کردوه.

عەبدوڵلا موخلیص بەگ کوڕی ئەسعەد بەگی کوڕی ڕەسول پاشا له (١٢٧٥)دا له بەغدایەدا هاتۆتە ناو گێتییەوه، زانیاریە کۆنەکانی لەلای مامۆستایانی تایبەتی فێربوه له پاش کۆچی دوایی باوکی بە ماڵەوە چۆتە کەرکوك وە له (١٢٩٨)دا له قەڵەمی تەحریراتی موتەصەرفیەتدا کاری کردوه، تا گەیشتۆتە پایەی مدیری تەحریرات وە له ساڵی (١٣٠٧)دا بە ناوی مەئموریەتی لێکۆڵینەوە (تحقیقات) چۆتە (کۆیە)و (ڕەواندز)ێ له دواییدا چەند جارێکی له (صلاحیە) و (معمورە)، (قەلادزە) و (ڕانیە) و شوێنانی تردا قائیمقامیەتی کردوه وە لەگەڵ محەمەد فازیلی پاشای چەچاندا بە سەفەر چۆتە لاجان وە له (١٣٢٥)دا له موسڵ کراوەتە معاونی مەکتوبچی تا ئیحتیلال وە چەندین مەدالیای له خزمەتدا وەرگرتوه وە له پاشی ئیحتلال ماڵەکەی گوێزتەوە هەولێر له (١٩٢٤)دا له بەغدایەدا بوو بە ئەندامی مەجلیسی تەئسیسی وە له (١٩٢٥)دا بوو بە نوێنەر (نائیب)ی هەولێر ئەو جاره ماڵەکەی گوێزتەوە بەغدایەو لەوێ له (١٩٤١)دا کۆچی دوایی کردوەو تەنها یەحیا بەگی له پاش بەجێ ماوه.

یەحیا بەگ کوڕی بەهەشتی عەبدوڵڵا موخلیص بەگی لە (١٣٠٦)ی کۆچیدا لە کەرکوکێ پێی ناوەتە ناو کوڕی ژیانەوە، چەند جۆرە زانیاریەکی لە قوتابخانە کۆنەکان و لەلای مامۆستایانی تایبەتی تا جامی خوێندوە و شەش مانگانیشی لە (اعدادی)دا خوێندوە وە لە (١٣٢٠)دا بۆتە سەرنووسەری دادگای نیزامیەی (کەرکوک)، (ڕەواندز) و (ڕانیە) تا سەردەمی ئیحتیلال. لە پاش ماوەیەك بێ ئیشی بۆتە مدیری ناحیەی (دیرەوحەریر) و مدیری مالی (کۆیە) و سەرنووسەری موحاسبی هەولێری و مدیری تەحریرات و یازدە ساڵانیش لە (ڕانیە) و (مەخمور) و (کۆیە) و (مەرکەزی سلێمانی)دا قائیمقامێتی کردوە، دوو جاریش لە هەولێرو سلێمانیدا کراوەتە وەکیلی موتەصەریف، ئیتر لەسەر ئارەزووی خۆی وازی لە فەرمانی دەوڵەتی هێناوەو لە هەولێرێ دانیشت و خەریکی ڕەنێو هێنانی سامانی خۆی بوو، بەڵام ئێستا چەند ساڵێکە بە ماڵەوە چۆتە بەغدایە، داخەکەم ئەو بنەماڵە خانەدانە هیچ کەسێك بە یادگار لە پاش خۆی بەجێ ناهێڵێ. وەستا ڕەجەب لە ١٢٧٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردوە کوریکی مستەفا ناوی لە پاش بەجی ماوە. مستەفاش کوری بوە ناوی ناوە نەورۆز حاجی نەورۆزیش ٨ مندالی بوە، وەکو نەجیب، محەمەد، عەبدورەحمان، شیخ سلیمان و صالح و زولەیخاو هتد. ئیستا لەوانە تەنها شیخ سلیمان و سالح ماون.

میر محەمەد پاشای رەواندزی کە بە هاندانی مەلای خەتی و مەلا یەحیای مزوری و مەلا عزرائیلی جزیری پەلاماری بردە سەر دیهاتەکانی شیخان وە دەستی بە یەزیدی کوشتن کرد، دوای کوشتاریکی بێئەندازە مالیکی زۆرو هەزاران ژن و کچی یەزیدیانیان بە تاڵان هینا لە تیپەرینیدا خۆی لە (القوش) نەگەیاند کە هەموویان فەلە بوون، بەڵام لە گەرانەوەیدا لەسەر ئارەزووی مەلا ناوبراوەکان لە ١٥ ئازار سالی ١٨٣٢دا کوشتاریکی بیجی و نارەوای لیکردن و سی پیاوی زۆر گەورەی ئاینیش لەو هەرایەدا کوژرا لەو کاتەدا (مەتران یوسف ئەودو)شیان گرت و ویستیان بیکوژن، گوتی حەز دەکەم لە پیش کوشتنمدا پادشای ببینم کە بردیانە لای محەمەد شا بە کوردی گوتی شاهم ئیمە بۆچی دەبێ لە دەست زولم و زۆری تورکاندا بپاریزریین، بەڵام لە سەردەمی پادشایەکی دادگەری وەکو تۆدا کەی رەوایە کە ئیمە تووشی ئازارو کوشتارو تالان بین. پادشا زۆر پەشیمان بۆوە و دەستبەجی فەرمانی دا کەس نەکوژن و ئەو هەموو ژن و کچ و مالیکی کە بە تالان برابوون دایەوە بە (مەتران یوسف ئەودۆ)ی وە بە هۆیەوە هەموو بە مال و خاوەندەکانی خۆیان گەیشتنەوە، ئیتر پادشای رەواندز هەر ئەودەمی ئەو هەریمەی بە لەشکرەوە بەجیهیشت و بەرەو رەواندزی گەرایەوە.

کاتیکی کە پادشا بە لەشکرەوە بە نزیك دیی (حتارا)دا تیدەپەری تەماشای کرد داوەت و رەشبەلەك و شایی و زەمزەمەی حەوت بوکان بوو لەبەر گەرمی بەزم و رەزمی هۆشیان لەوە نەبوو کە بە پیریانەوە بچن و یا ریزیان لیبگرن و یا چ هیزو سوپایەك گەیشتۆتە ئاوایی ئەوان پادشا پرسی خەلکی ئەو دییە چین؟

هەرکە پیی گوترا (یەزیدین) دەستبەجێ فەرمانی دا کە تالانیان کەن و بیانکوژن لەویش دوای کوشتاریکی قورس مال و ژن و کچیکی زۆریان بە تالان برد. میری میران بەبێ ئەوەی کە بیر لەوە بکاتەوە کە ئەو بیچارانە هەرچیەکی هەن خۆ کوردن، لەسەر هیچ و خۆرایی و بەبی تاوان شایی و زەمزەمەو خۆشی لی کردنە شین و شەپۆر.

هەرچەندە محەمەد پادشا دەولەتیکی ئازادو پیشکەوتووی کوردی دامەزراند و میژووی کوردانیشی تازە کردەوە، کاتیکی کە ئەو تۆپ و هەموو جۆرە چەکیکی لە رەواندزیدا دارشت و دروستی کردن، تورك عەجەمان سەریان لە فیشەك دروستکردنیش دەرنەدەچوو، بەلکو تورکان چەکیان لە ئەلمان و عەجەمانیش لە رووسانیان دەکری، سەرەرای ئەوانەش میر محەمەد پاشا تاوانی زۆرەو چاویان لی ناپۆشرێ.

نازانم میر بۆ سوودی چ دوژمنیکی کوشتاری لە برا یەزیدیە کوردەکان کردو بە هەزاران مال و ناموسی وانی بە تالان بردو بەسەر ئەم و ئەویدا بەشیەوە لە کاتیکیدا کە میر خەریکی راونانی تورکان بوو بۆچی بەبێ شەرو بیجێ کوشتاری لە فەلەکانی (ئەلقوش) کرد، کە هەزاران سالە لە کوردستانیدا بە خۆشی و ئارامی و هیمنی ژیاون خوا فەرموویە (لا تجادلوا اهل الکتاب الا بالتي هی احسن) واتا لەگەڵ خاوەند کتیبان بە شیوەیەکی جوان نەبی پیلەبازی مەکەن) جا بەبێ تاوان چۆن رەوایە بکوژرین.

دەستوری دەولەتی محەمەد پاشا قورئان و هی عوسمانیان بە پیچەوانەی قورئان بوو، کە مەلا سەر بە تورکەکان دەیانگوت تفەنگ بە تورکەوە نان زیانی بۆ ئایین و تەڵاق هەیە دەبوو میر چەند مەلایەکی تری خوداپەرست کۆکاتەوەو لییان بپرسیت قورئان یا حەدیسەکانی پیغەمبەر لە کامە شویندا قۆلیان بۆ ئەوە کیشاوە کە تورك پەلامار بەریتە سەر کوردان و بیانکوژی غەزایە، بەڵام کوردان بۆ پاریزگاری خۆیان دەست بوەشینن کافر دەبن و تەڵاقیان دەکەوێ؟!!!

گەورەترین تاوانی میر ئەوەبوو کە مەیدانی دا مەلایان خۆیان تیکەل بە کاروباری دەولەت بکەن.

**سەرچاوە:**

میژووی میرانی سۆران، ل (٨٢-١٠٩) داماو
(حسین حوزنی موکریانی) چاپی دووەمین/ چاپخانەی
کوردستان- هەولیر ١٩٦٢

# پێم وایە تەنیا کەسێك کە بۆ مەرگی حوزنی گریابێت من بووم

## حوزنی لە یادەوەری "هەژار"دا

لەو بەینەدا کە نۆکەری دیوەخان بووم، یەکێك هات گوتی: "حوزنی موکریانی بیستویە هەژار لێرەیە". حوزنی بە جاسوسی ئینگلیز ناوی زڕابوو، نەعوزوبیللا؛ مام حسێن گوتی شتی وا لێرە نیە. ڕۆژێکی دی، سەر لە ئێوارە سەیدێکی ڕیش سپی تەنك، دەستەبالاّی، لاواز، هاتە حەوشەی دیوەخان و قسەی دەگەڵ مام حسێن کرد. مام حسێن هات گوتی: "ئەوە سەید حسێن حوزنییە، دەیەوێ بتبینێ". چار نەمابوو. تەلەفۆنێکم لە دوکتۆر "جەعفەر محەمەد کەریم" کرد کە دەمناسی و ناوی زۆر چاکی هەبوو، گوتی سەید حوزنی پیاوی چاکەو دیتنی زیانێکی نیە. دەگەڵ حوزنی بوومە ئاشنا. ئێستاش لە بیرم ناچێ کە دیتمی فرمێسك بە ڕیشە سپیە جوانەکەیدا هاتنە خوار.. ئادرێسی ڕۆژنامەی "دەنگی گێتی تازە"ی دامێ کە خۆی سەرمودیرو هاوکارێکی بەناوی "حەمە عەلی بەگ" خەڵکی سولەیمانی، سەرهەنگی بازنشەستە هەبوو. جارجارە ئیجازەم لە مام حسێن وەردەگرت دەچوومە لای. ئەو کابرا پیرە موحتەرەمە یەکێ لەبەرم ڕاست دەبۆوە، دەیگوت تۆ یادگاری جمهوری کوردستانی.

حوزنی لە گوندی (نیچکە)ی نزیك (بوغدەکەندی) سەر بە بۆکان هاتۆتە دنیاوە کە ئێستا نیچکە نەماوەو زەمانی من شوێنەواری دێیەکە مابوو. باوکی لە سەیدەکانی بوغدەکەندی و ناوی "سەید لەتیف" بوەو زوو مردوەو دایکی "خات سەلما" مێردی کردۆتەوە بە کابرایەکی ورمزیار کە "گیوی موکریانی" دەبێتە دایك برای حوزنی. هەر لە منداڵیەوە حوزنی پەرەوازەی وڵاتان بوە: لە ئەستەمبوڵ فێری مۆرهەڵکەندن کراوەو بەو پیشەوە گەڕاوە. بۆتە سەیاح لە کوردستاندا، سەری لە کوردەکانی تورکیاو ئەرمەنستان و عێراق داوەو لە زەمانی فەرمانداری "سەید تەها" لە ڕەواندز دامەزراوە. بە سەلیقەی خۆی کەتە چاپخانەیەکی لێك داوە، کلێشەی لە دار هەڵکەندوەو بۆ یەکەمجار لە کوردستانی عێراقدا نوسراوی بە کوردی بڵاوکردۆتەوە.

لە زەمانی ڕەئیس ستادی "فایق کاکەمین"دا کە کوردێك بوە- لە عێراق دەرکراوە. چۆتە شاری حەڵەب، لەوێش چاپخانەیەکی چکۆلەی دەست و پا کردوەو ملی لە کاری کوردایەتی ناوە. لە حەڵەبیش ئاویان دە بن کردوەو بێدەرەتان ماوەتەوە. لە سەرەتای شەڕی ئاڵمان کە فەرانسە لە سوریە لە ڕێگەی گۆڤاری ڕوناهیەوە دڵی کوردیان خۆش دەکرد، ئینگلیز لە بەغدا بۆ کوردی زمانی خوێندەوار گەڕاون و داوایان لە حوزنی کردوە بێتەوە بەغداو گۆڤاری "دەنگی گێتی تازە"یان بۆ بەڕێوە بەرێ. حوزنی لە "ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و عێراق" بەناوی "عەلاقاتی عاممە" دەستبەکار بوە. لە ڕوپەڕێك و دواندا خەبەری شەڕو لە پتر لە حەفتا ڕوپەڕدا فۆلکلۆری کۆنی کوردی زیندو کردۆتەوە، شیعری شاعیرە باشەکانی لە چاپ داوە. ئێستاش هەر کەس هەموو ژمارەکانی لابێ زۆر بەختیارەو زۆر مەعلوماتی باشی لێ دەست دەکەوێ.

حوزنی لە کوردایەتیدا سوتابوو، دین و ئیمانی کوردستان و ئازادی کورد بوو. جسنی عەرەبی زۆر ناخۆش دەویست. لاشی وابوو هەر بەڵایەك لە دنیادا هەیە تاوانی ئینگلیزە، تەنانەت دەیگوت: "بە دووری نازانم ستالین کاربەدەستی ئینگلیز بێ!".

جارێ گوتم: تۆ سەیدی، دەبێ ڕەسەن عەرەب بی.

پێکەنی، گوتی: بیستم کە ئەڵمان لە خوێنەوە ڕەسەنی گەلان دەناسن، خوێنی خۆم ناردو جوابم بۆ هاتەوە کە تۆ ئاریاییت، شوکور ئەم سەی سەیەم لە کۆڵ بۆوە!.

جارێ گوتی: "کوڕە سەیری کەریەتی من کە. لە گەشت و گوزارەکەم لەناو کوردستانی تورکیەدا، شەوێك لە گوندێکی حەنەفی مەزەب لەسەر ئیمامی شافیعی کە گوتم باشە، ئەوەندەیان دارکاری کردم دوو ڕۆژ وەهۆش نەهاتمەوە، کەس نەیگوت تۆ کوردێکی چت لە شافیعی داوە؟!".

ئەوەندە گفت و لفت خۆش و ئاگادار بوو، پیاو حەزی دەکرد هەر گوێی بۆ ڕادێرێ. ڕۆژێك گوتی: "بە داخەوە کورد چونکە هەمیشە ژێرچەپۆکە بوون، شاعیرو نووسەری گاڵتەچیمان لێ هەڵ نەکەوتوون، کە گەپ و گاڵتەش بەشێکی گرنگە لە ئەدەبیاتدا". من باسی "مەلا حەسەنی دزلی"م بۆ کرد کە زۆر گاڵتەچی بوەو بە داخەوە لە برسان مردوە. نمونەی کردەی ئەو پیاوەی لێ خواستم، شیعرێکم بۆ خوێندەوە کە لە مەریوانەوە بۆ فەقێیەکی برادەری خۆی بە ناوی "حەمەدەمین هەمەوەندی" بۆ شاری سابلاغی نوسیوە. من وەك عادەتمە، لە خوێندنەوەی شیعری لەبەردا چاو

لەسەر یەك دادەنێم. لەو ناوەدا چاوم هەڵێنا: ئەو پیرە ریش سپیە بە دەست و پێ سەمای دەکرد. گوتی: "پیاوێك دەنێرم کە بە دووی نوسراوی ئەو پیاوەدا بگەڕێ و لە ڕۆژنامەی دەنگی گێتی تازەدا بڵاوی دەکەمەوە"، کە بە داخەوە مەرگ ڕێگەی نەدا. ئەمەش بڵێم کە لە پاش نەمانی شەڕ، گۆڤارەکە هەڵگیراو ئیمتیازەکەیان دابوو بە حوزنی، بە ڕۆژنامەیەکی چوار لاپەڕی دەری دەکردو ئەدەبیاتی کوردی تێدا دەنووسی.

***شیعرەکان ئەوەندی لە بیرم ماون ئەمانەن:***

***"ای عازم ساوجبلاغ، عرض سلام این حزین***
***بخوان کسی را نام او اندر دهانم انگبین***
***چابك همونڈی کە او، در وقت غارت بارها***
***برکندە بزها پوست را، درویشها را پوستین***
***محمد امین اسمش بود***
***اول محمد آمدە، آخر نقیض لا امین***
***باری اگر مرسولە ای ننوشت سوی این طرف***
***منعش نباشد ز آن مکان، گر غافل است ازما چنین***
***شهر سیە چشمان وی همچون غزالان ختن***
***تعطیر ناف دلبرش چون نافەی آهوی چین***
***پیکان مژگان سیە، بر سینەی هرکس زنند***
***فوارە اش بالا رود، تا آسمان هفتمین***
***بەرخولة، دو شحمة، تاقانة في بلدة***
***قتالة بالغمزة، با آن دو چشم نرگسین***
***آتش بە جانها افگنند، وقتی کە چون کبك دری***
***آیند بیرون از حمام با آن خدود آتشین***
***پشمینە پوش اطلسی، زنگاریان قاوسی***
***جنبیدن دسمالشان گە بر یسار و گە یمین***
***لو عانق الانسان بالبنت التی من قربکم***
***صادر شود بی اختیار، از وی ریاح فا و سین (=فس)***
***درویشهای کولکنین، ریش نیری و زورنا کەپۆ***
***سەر چۆلەکەی، گون کولەکە مانند جاموس بطین***
***بینند چون آن لعبتان، چون دیوشان دربر کشند***
***با بۆلەبۆل و فیشە فیش، با لرفە لرف و ئاخنین"***

ڕەنگە چەند بەیتێکم لەبیر نەمابێ.

لە خۆشەویستی موکریان و تایبەتی سابڵاغدا لە رادەی تیپەراندبوو. ڕۆژێك کە منی دەدواند و زۆر باسی سابڵاغی کرد، محەممەد عەلیەکەی یاریدەدەری پرسی:

—ماموستا وا دیارە تۆ خەلکی سابڵاغت زۆر خۆش دەوێ؟

گوتی: بەلێ سەگیکی سابڵاغم لە ........ خۆشتر دەوێ.

گوتم: "کاکە حوزنی چونکە کاری ئینگلیزانت کردوە، هەموو کەس بە جاسوس و خەتەرت ناو دەباو منیش لام وابوو توشم بیت دەم خۆی!".

—خودا دەی زانێ، بەڵام کە لە عیراق دەرکرام پەنام بە عەلی کەمال برد کە زۆر دەستی دەرۆیشت. لە گەرمای نیوەرۆی چل و هەشت دەرەجەدا لە دەرگام دا، هاتە دەر:

—مامۆستا خیرە؟

—لە عیراق دەرم دەکەن.

—راوەستە ئیستا دیم.

تاویك لەبەر دەرگا ویستام. دەرگا کرایەوە، هەر نوسراویکی بە دیاریم بۆ ناردبوو دە باوەشی دابوو، لەبەر درگا هەلی رشت و دەرگای لە روو پیوەدام. زۆر کەسی تری وەکو ئەو، وەك ئەویان لەگەڵ کردم، کە بە ناوی کارمەندی ئینگلیزیان هاتومەوە. ئیستا نە شەرم و نە حەیا، هەموو ئەو پیاوە زلە کوردانە فەخر دەکەن کە قسەیان لەگەڵ بکەم. بەدناویم لەناو لاوە کوردەکانیش هەر ئەوەندەیە دەلیم زگ ئیشەی بە تەنیتان نەبێ، ئیوە عاشقی رووس و ستالینن و مەعشوقە تفیشتان پیدا نادا. با بۆ بەرژەوەندی کوردستان خەبات بکەین و لە ریگەی ئازادیدا دەگەڵ شەیتانیش ببینە دۆست. با جگە لە ئازادی کورد کەس نەپەرستین..

لە ئاکاری شیخ مەحمود زۆر نارەحەت بوو، کە ئینگلیز کردیانە فەمانرەوای کوردستان، کەچی بە هەوای دین و دنەدانی



تورکان دەگەڵ ئینگلیز بەشەڕ دەهات؛ دەنا هەر وەك یاریدەی فەیسەڵیان داو دەوڵەتی عێراقیان بۆ دامەزراند، ئەویشیان کە جێگەی متمانە بوایە دەکردە دەوڵەتۆکێك و لە مەسڵەحەتیان بوو. دەیگوت: "کاتێ خەبەری تێکچوونی کوردستانی موکریم بیست، زۆر بە تاڵی گلەییم لە سەفیری ئینگلیز کرد، گوتی: حوزنی، ڕەفیقانی ئێران ڕاستیان کردو ڕەفیقانی کورد درۆزن دەرچون..".

مەحمود ئەحمەد گوتی خەریکن بمگرن و حقوقم ببڕن، دەگەڵم وەرە لای حوزنی دەڵێن تۆی خۆش دەوێ. مەحمود وەك هەموو کوردێکی دیکە، جوتێك سمێڵی ستالینی و کراواتێکی سوری نیشانەی کمونیستی پێوە بوو. حوزنی زۆری بە خێراتن کردو کە باسەکەم پێگوت گوتی:

—باشە هەرچی لە دەستم بێ قوسور ناکەم، بەڵام کاك مەحمود تۆ دەزانی عەرەب عەقڵیان لە چاودایەو لە مێشکدا نیە، ئەگەر دەکرێ تۆزێك سمێڵەکانت سوك بکە تا بتبەمە لای کاربەدەستان.

مەحمود خۆی لێ توڕە کرد:

—جەناب تۆ جاهیلی، نازانی کۆمونیست چیە! من فەخر دەکەم کە بە کۆمۆنیستم بزانن! حوزنی زۆر بە نەرمی گوتی:

—ڕاستە جاهیلم، تۆ دەتوانی بە زمانێکی سادە پێم بڵێی کۆمۆنیست چی زۆر باشە؟

—تۆ نازانی لە ڕوسیە هەموو کەس نان و کاری دەدرێتێ؟

—کاکە مەحمود گیان، خۆ زیندانی بەغدایش نان و کاری تەواویان هەیە!

کاری مەحمودی هاسان جێبەجێ کردو زۆری مەمنونی خۆی کرد. جارێك باسی بەدفەڕی هێندێك نەجیب زادان بوو، حوزنی گوتی: "من کە لە ئیدارەی گۆڤار بووم قەت نەچووبوومە سەفارەتی بەریتانیا، تەلەفۆن کرا کە سەفیر دەیەوی بتبینێ. بردمیە پەنایەك و بە سرتە گوتی: کوردێکی زۆر گرنگی ڕوسیەمان لە لایە، تۆ بیدوێنەو دڵۆخشی بدەوە، لە ژورێکی تایبەتی کوردەکەم دیت. خوایە من وەك ئەو کابرایە بناسم وایە.

—کاکە ناوت بەخێر؟

—مامۆستا حوزنی ناناسی؟ من عەمەراغام، نۆکەری حاجی سەید عەولا، چەندم چایی بۆ داناوی؟

—تۆ و ئێرە چی؟

—بەدبەختی. سەید پۆشۆی سەید تەها هەڵی فریواندم: وەرە دەتکەمە کوردی ڕوسیەو دەت بەم بۆ سەفیری بەریتانیا و پولێکی باشت دەست دەکەوێ. وا لێرە وەك حەپسی وام و ئەوا لە ترسانتیش زراوم چوە، دەخیلە ڕزگارم کە.

سەفیر لە دەرێ هات و دەچوو، چاوەنۆڕی خەبەری خۆش بوو. نیك و بەدم بۆ گێڕایەوە، وەك بیست کەس قدیلەکەی بدەن ملی لە پیکەنین نا:

—ئەو پۆشۆیە پتر لە بیست جاران دەستی بریوم، بەڵام دیسان فایدەی لی دەبینم!

پولیکم بۆ عەمەراغا ساندو ناردمەوە سنوری ئیران".

هەر حوزنی گیرایەوە کە لە هەولیر بووم، دەچوومە دیدەنی حاکمی ئینگلیز، مەلایەکی لە باری کەلەگەتم دیت لە دەرگای حاکم کز ویستابووم. گوتی:

—سەید توخوا وا بکە حاکم ببینم، چەند رۆژە ریم نادا.

حاکم لە جوابما گوتی:

—ئەوە مەلا خەلیلی گۆڕۆمەرە، ئەوی پیمان سپاردبوو، باشی پیك نەهینا، ئیستا داوای پول دەکا. پیی بلێ ئەگەر خۆی نەشاریتەوە پۆلیسی عیراق دەیگرن.

ئەوسا تیگەیشتم کە ئەو پیاوە مبارەکەی ئەو هەموو مەنگورەی بە کوژداو مالویران کرد، کێ ناردویەو رەسول ناجی کە ئیمە لە سابلاغ گرتمان و دەرکەوت جاسوسیکی گەورەی بەریتانیایەو دامانە دەست رووسان، لە خەزای مەلا خەلیلدا راویژکەری هەرە نزیکی بوە.

"تەوفیق وەهبی" وەزیری کارو رێ و بان بوو، لە ئەدیبە بەناوبانگەکانیشە، رۆژیك شیعری "لیفە شرە"ی من بۆ حوزنی دەخوینیتەوەو دەلێ:

—کەمتر شیعری وا باشم دیوە، خۆزگە ئەو شاعیرەم بدیبا.

حوزنی دەلێ:

—ئەوە لە بەغدایەو پیخواس و رووت و برسییە، بیکە بە کارگەریکی سادە.

—ئەی دەغیلە حوزنی، پیی بلێ خۆی بشاریتەوە نەوەك بیگرن!

حوزنی ئیمتیازی مەجەللەی "زاری کرمانجی" کە لە رەواندز دەینوسی و لیی هەلوشەینرابوو وەرگرتەوە. بریاری دا کە بیداتە دەست من. بەیانیەك برادەریك هات، گوتی: "حوزنی کوتوپڕ مردوە، با بچینە سەر قەبران". چەند دیمەنیکی دلتەزین بوو: جەنازەکەی لەسەر خاك دریژ کرابوو تا قەبری تەواو دەبێ، جگە لە من و برادەرەکە هیچ کەسی لەلا نەبوو. بیرم لە قەدرنەزانی کوردان دەکردەوە، گریانیکی زۆر بە کول گرتمی و پیم وایە تەنیا کەسیك کە بۆ مەرگی گریابێ من بووم.

حوزنی کە بە جاسوس و هەمەکارەی ئینگلیزیان دەزانی، زۆر بە فەقیری مرد. جگە لە کتیبخانەکەی، هەموو ناومالی، یەك- دوو بەرەو چوار نیمکەتی دار بوو. منالی نەبوو. ژنەکەی کوردی تورکیە بوو. "گیو" کتیبەکانی برد، ناومال بۆ ژن ماو کارەکەری مالانی دەکرد.

**سەرچاوە:**

چیشتی مجیور، هەژار موکریانی، چاپی یەکەم، پاریس ١٩٩٧، لاپەرە (١٢٢-١٢٦).

**تیبینی:**

١-شاکر فەتاح، لە زمانی گیوی دایك برای "حوزنی"یەوە دەلیت: حوزنی لە سابلاغ لە دایك بوو، کەچی هەژار لەم نووسینەدا دەلیت لە گوندی "نیچکە"ی سەر بە بۆکان لە دایك بوە.

٢-هەژار دەلیت "گیو" دایك برای "حوزنی"یە، بەلام گیو ئاماژەی بەمە نەداوە.

(رۆڤار)

# دینی کوردان

ح. ح. موکریانی (داماو)

دینی کورد قەدیم زۆر لە پێشوودا لە ئیسمی (مەه ئاباد)، شەخسێك ئیدیعای پێغەمبەریی کرد، تەمەدونێکی دینی و مەزهەبی لەنێو کوردستاندا بیناکرد، لە نەزەریات عولەمایاندا ئەو زاتە (و نەوە) و (نەبیرە) ئەویش لە پێش پێشدا تەشکیلی حکمداریان کردبوو.

غەیری ئەویش زۆر کەس ئیدیعای ناردراویان کردبوو بە ئیدیعا بە ماڵی کورد و ئێران- وەکو باقی ئەقوامی ئاری عبادەتی ئەجرامی سەماویان کردوە علی الخصوص (ڕۆژ) و مانگ و ئەستێرە پەرستن یان بوە (مە) پەرستن لە زاتی مەزکور ەوە تەئسیس کرا. ئەسڵی مەعنای (مە) کورە اسم بو، ئەوەل بە نیەتی شاهدە لە پاش ئەو زاتە مانگ بە (مە) تەسمیە کراوە (ڕۆژ) پەرستن لە پێش ئەوەوە زهوری کرد چونکە (جم-جەم) بە مەعنای ئەرکانی دین (شید) پەرستدە مەعبود ئەرکان امی (خورشید)ی ئەو زاتە خورشید پەرستی خستە مەیدان و می جامی ئیجاد کردو کردیە ڕوکن بۆ ئاین و (نەورۆز)ی کردە جەژنی زاهیری ئەو وەختە، بۆ هەموو ئەستێرەیەك هەیکەلێکیان دروست کردبوو لە هەموو جێگایەکدا دایان نابوو، لە ئەغلەب ماڵ و سەرایاندا مەوجود بوون لە براوە لە علمی فلکیدا زۆر مەهارەتیان حاسڵ کردبوو، تەرەقیان لە منەجمی‌دا گەیبوە دەرەجەی نهایەت، لە مەسئەلەی حەزرەتی ئیبراهیم عەلەیهی سەلام دا لێمان مەعلوم دەبێت خودای تەعالا حەزرەتی ئیبراهیمی لەسەر ئسوڵی ئاینی کوردانی فێرکردبوو بەڵکو بۆ ئیلزامیان ئەوەڵ حەقناسینی لە ئەستێرەو مانگ و ڕۆژەوە نیشان دان ئەویش بە نەصی قورئانی مەسبوتە و شکی تێدا نیە کە ئیزهاری ئەمە دەکا کە (کورد) ئەستێرەو مانگ و ڕۆژ پەرستیان دەکردو بتیان بۆ ئەو ئەجرامانە دروست کردبوو، ببوە تەقالیدی حەزرەتی ئیبراهیم کە لە پاش ئەوە دەبێژێت ئەوە خودامە ئەستێرە ئاوا بوو مانگ دەرکەوت دەڵێت ئەمەیە خودا ئەویشی ئاوا کرد، خودایە کە مانگیش ئاوا دەبێ ڕۆژ دەردەکەوێت، دەڵێت ئەمەیە خودام چونکە لە هەمووان گەورەترە کە ئەویش ئاوا بوو فەرمووی (آنی وجهت و جهی) ئەی قەوم من لە شیرك دووركەوتمەوە، ئەوە ڕوی خۆم کردە خودایەکی ئاوانەبوو و ئەرز و ئاسمانی ئافەریدە کردوە (دوەم) کە بتەکان دەشکێنێت ئیسباتەو کە بە باوکی دەڵێت تۆ ئەصنامت بە خودا قبوڵ کردوە. تەماشا دەکەم تۆش و قەومەکەت لە زەلالەتێکی ئاشکرادان، ئیسباتی بتپەرستی کوردانە و لە وەختێکی کە دەفەرمووێ من نەمشکاند لە هەموان گەورەتر شکاندی، ئیسباتە بۆ ئەوەی بتانی موتەعەددیان هەبوەو ریوایەتی قازی بەیزاوی لە عەبدوڵڵای ئیبنی عومەرەوە ئەو کەسە ئیشارەتی بە سوتاندن کردو گوتی بیسووتێنن نەسرەتی خوداکانتان بدەنە پیاوێك کە (کورد) و نێوی (هیزن) بوو، مەعلوم دەبێ و شاهیدێکی لەوە چاکتر نیە کە قورئان ئیسباتی ئەوە دەکات حەزرەتی ئیبراهیم (کورد) و نەمرود و زەرایی کورد بوون، تەفسیر بەحسی زۆر لە عولەماو موئەریخان ئەو موباحەسە ڕابردوە ئیسبات دەکەن و صاحب برهان قاتع دەڵێت حەزرەتی ئیبراهیم ئیسمی ئەسڵی (زەردەشت)ە ئیبراهیم لەفزێکی سریانیە یەعنی ئەبرەهەم (اب رحیم) لە پاش هیجرەتیان لە دەست (بیوراسب) هەر وەکو لە دنکە دنکی ملیت دا بە درێژی بێژرا، سریانیان نێویان نا باوکی بە میهرەبان، خولاسە حەزرەتی ئیبراهیم دینی صائیبەی لە کوردستاندا نەشر کرد. لە ئەوڵیشدا خودایان ناسیبوو لاکین لە هاتوودا ئەحواڵیان دەبێژین. ئەغلەبی موئەریخان لە سەر ئەوەن حەزرەتی ئیبراهیم لە عەهدی بیوراسبدا داهاتۆتە وجود هەر چیکو بیوارسبە موئەسیسی ئایین مارپەرستی بوو لە زەمانی ئەودا مارو گەنمیان دەپەرست، لە بەعزێ ئاساردا کەشف کراوە (مەتران یوسف دبس) لە تاریخی سوریەدا جەلدی ئەوڵ ئەو بەحسە بە تەفسیلی دەگێڕێتەوە، ئیسمی بیوراسب بۆ ئەوە شاهیدە یەعنی ماری گزندە چونکە لە دنکەدنك دا بەحس کرا لازم بە شەرح نیە موراجەعەت بکەن.

کورد لە پێش دەرکەوتنیان لە وەتەنی ئەسڵی ئەو ئاشوبی دیانەتە و تەفرەقەی مەزاهیب و ئیعتیقادەیان تێ کەوتبوو چونکە لە جێگای خۆیاندا کتێبی زیندووی ئێیستایان کەوتبوە ناویان لە پاش بەسەردا دانی زوحاك لە زوڵم و تەعەدی ئەو دەستیان بە هیجرەت کرد. حەزرەتی ئیبراهیم لە وەتەنیاندا تەلقینی دیانەتی خۆی کردبوون لە پاشان نەهاتنە جیبال و کێوانی هەورامان و شارەزووردا ورفەو دیاربەکر مەعمورە العزیز.

بینا لەسەر ئەقوالی موئەریخان لە ئێراندا (زەردەشت) بە دانەری قانون، یان بە پێغەمبەرێکی ناردراو دەژمێرێت. دەڵێن لە عەهدی جەمشیدا هەبوەو لە سەر ڕوی دنیا بوو. زەردەشت لە ئازەربایجاندا لە شاری (ورمیە) لەدایکبوە لەگەل هرمز یزدان یەکدیان چاوپیکەوت و ملاقاتیان کرد، لە هرمز کتیبی موقەدەسی (زندە ئاویستا)ی وەرگرت زەردەشت لە ورمیە هەڵات و هەندیك ئەشخاسی لەگەڵ چوبوە، بەسەر ئاوی چۆمی ئاراز (ارقس) و بەحری خەزەردا ڕابوردن، گەلیك پیاوان وەدویان کەوتبون و

حەملیان دەبرین مولاحەزەی وەزعیەتیان کردبوون بەسەر ئەواندا دەرباز دەبوو و دەچوو (زەردەشت زۆر ساڵان بە تەنها لە کێوانی چوڵدا بە حاڵی مستعرقدا بەسەری بردبوو لە ئاقیبەتی ئەمردا لە کێوی ئەتراف ورمیە کە مرکور نوچیا کو رونو چیابیا هاتە خوار ڕووی لە (بەلخ) کردو کتێبی زندە ئاویستای تەقدیم بە خەلق کردن و ئەمرو نەواهی فێرکردن و دەستی بە تەبلیغاتی دینی دەکا، گشتاسب حوکمداری بلخ تەلەبی موعجیزاتی لێ دەکا، ئیسباتی پیغەمبەریتی لی خواست دەچێ لەنیو لوکەدا پارچە ئاوری بۆ دەبات نە لۆکە و دەست کەسی دەسوتاند. گوشتاسپ موعجیزەی دیکەی لی داوا کرد، زەردەشت هەندیکی کتیبەکەی بۆ خویندەوەو گوشتاسپ ئیمانی پی هینا، عولەمای بەلخ رجایان کرد پادشا ئەزیەتی نەدا گوشتاسپ بە هەموو رەزایەك ئاینی قبول کرد و (زندە ئاویستا)ی لەسەر پیستی دوازدە هەزار گامیشی بە زیر نووسیەوە بە نەقش و نیگار جوان کراو زەردەشت بەو موفەقیەتە نفوزیکی تەواوی پەیداکرد و هەموو کەس باوەری پیکردو لەلای هەموان ئاینی قبول کرا ئەو موفەقیەتە بوو بەسەبەبی پەیدابوونی دوژمنان و قوەی ناتیقەی و موعارەزەی کورد. زانین و مەعلومات هەم دوژمن وە هەم دلی عالەمی تەسخیر کرد.

زهوری ئەو دینە بوە سەبەبی موحارەباتی دینی و جیدال. ئەو دینە بوو بە سەرکەوتنی گوشتاسپ لەسەر تەواوی جیهان بە قوەت شەری خستە نیوەراستی هند و ئاسیاوە.

لە هەندیك ئاساردا نقل کراوە سەحیفەی سەرەوە کە دینی کوردان وەکو دینی زەردەشت بێ، موهتری و چهتری ئەدیانیك بۆ بەشەر قبولی کردبوو نزیك تری عەقل و عەدالەت و ئەنساف بوو (اصول) ئەو دینە قبول کردنی مادە بکەن یەعنی قبول شتیکی مادی کە خودا لەو مادیەدا موجود بێ خودا زاتیکە لەودایە(لەبەر ئەوەیە لە نیو موئەریخاندا وە لە ئیستلاحی عولەمایاندا بە کوردی قەدیم (مەدیا) دەبیژریت چونکە بۆ خودا شتیکی مادیان قبول کرد، ئەو دینیش لە پیش هیجرەتیاندا دانرابوو و بینایان نابوو زەردەشت ئەو دینەی ئیسلاح کرد و کتیبی زیندە ئاویستای بۆ ئیسلاحاتی ئەو دینە قەرار دابوو. لە کتیبی ئەو زاتە عەزیمەداو مەسلەحەتی گەورەی ئەو فەزیلەدا دەبیژیت هەرچیکو (معبود) واجبە و دەبێ موجەرد بێ لە مادەو لەسەر مادان تەسەلوتی هەبێ ئەو مەعبودە نەوعی بەشەری بە روحیکی سالح ئافەریدە و هەموو شتیکی تەمەتوع لەو دەکا ئەو مەعبودەشیان بە (هرمز یزدان) ناوبرد. هەموو سیفاتیکی چاکی بۆ ئیسبات کردو لەشکرو سوپای لە ئەرواح سالحی ئەوەوە بۆ قەرار داو وەکو مەلائیکە بن خزمەتی دەکەن (قاعدەی کتیبیی زەردەشت) دەبێ ئینسان لە بەرابەری روحی سالحدا لە دائیرەی قانونی عەدالەتدا بە بێ زەرەری بژیت بە هەموو ئیسلاحیکەوە تا رۆژی مردن بە سەری ببا (مکافآت) لە موقابلی عەمەلی خەیر و شەردا بەم نەوعە تەسەوری پێ دەدا: (هەر کەس لەنیو خۆلدا گەنم هەلگریت و لە ئاوبنێ و لە زەویدا خونچەی ئەو گول و میوە پێ بگەیەنیت، ئەو کەسە لە دنیادا نەشری خیراو فەزیلەت دەکا هەروکو سەد قوربانی سەرببریت ئەو کەسە شەرەف و حەیسیەتی ئاینی (هرمز) بە تەواوی زیاد دەکا.


دەستنوسیکی ئاڤیستا

(لە پاش مردن ئەحوالی روح بەم سورەتە حەل دەکا)

مەلائیکە، فریشتەی (راشنو) ئیسمیك، ئەفعال و ئەعمالی چاکەو حەسەنە و پیسی ئینسان بە بێ خەتەئو سەهو بە تەرازوی عەدالەت دەکیشیت، ئەویش بە شاهیدی ئەعمال و خەتی ژیان و ئەفعالی حەیاتی و چاوپیکەوتنی ئەو رۆحە محاکەمە دەکریت تەواوی ئەحوالی دیتە حسابەوە ئەویش یا تەبریە دەکریت یاخود مەحکوم دەبێ و روحیکی لە مەحکەمە دەرکەویت دەبیت بنەبر مەدخەل ریگایەك بۆ سەر پردی (سن وا) راکیشراوە بۆ بەهەشت، ئەگەر ناپاك بی لە پرد رانابریت دەکەویتە ئەو ئاگرەوە، ئەگەر پاك بێ بە معاوەنەتی فریشتە (سرائوشا) ناویك بەبێ زەحمەت لە پردی (سن وا) دەپەریتەوەو دەچیتە بەهەشتەوەو ئەو زەمانە بە حزوری مەعبود و هرمز دەگا هەرچیکو (حشر)ە تا موقعیکە مردو ئەشغالی دەکەن وە لییان دەپرسن کتیبی زندە ئاویستا مەبنی بوو لەسەر ئەمرو نەواهی وەعدو وعیدو ئەحوال مازی و موستەقبەلی تیدا نوسرابوو (ئەم دینە لە زمان سواری ئیوەدا لغا ناکریت و اکراد عالمی بنوتیش کا لاکن ئەمانیشتان خۆتان بێ لە سواری وشتر سوری چادریش چونکی ئاینی ئیوە مەحو دەکات) زەردەشت سر دەفعە ژنی هینابوو، ئەولادو ئەحفادی وزیتنی زۆر بوو، دکلیکی هینابوە وجود، لە پاش حەفتاو حەوت ساڵان عومر سالی هجومی تورك بۆ سەر کورد وە ئیستبدادی بلخ دەکەن لە دەست تورکدا کوژرا، هەندیك دەلین، تا قەرنی شەشەمی ق. م مابوو وە لە زەمانی

جەمشیدا مەجود بوە (العلم عند الله) واتە زەردەشت بە تەعەهودی گشتاسپ لەسەر ئەو عەقیدە باقی مابوو.

## پەیدابوونی ئاورپەرستی

لە سەنەی ٥٣٤ی قەبلە عیسا عەلەیهی سەلام دا (غوماتیس) نێوێك، زهوری کرد بە سمردیس برای کیکاوسی دوم (کمبیز) خۆی تەسمیە کردو ئیستیلای کردە سەر کوردستان و بە ئیدعای برایەتیەوە کیکاوس ئەرزی کوردانی زەوت کرد، کەوتە نێو تەواوی حکومەتەوە و تەداخولی بە حەرەم سەرای پادشایی کرد هەمو ژنی کمبیزی مارە کردو خستیە دەستەوە، ئاینی ئاورپەرستی ئیعلان کرد، لە ئازەربایجاندا بینای ئاتەشکەدەیەکی زۆر گەورەیان کردبوو. هەموو مەعبەدی زەردەشتی وێرانکرد، لە جێگایدا ئاتەشکەدەی بینا نا، ئوسوڵی دیانەتی لێ گۆڕین. قاعیدەیەکی بۆ ئەو دینە مەجبوریە مەجوسیانەیان دانا کە (ئەهریمەن) مەعبودی شەڕ و (هرمز) مەعبودی خەیرە، ئەو ڕۆحە شەریرە موقابەلەی ڕۆحی ساڵح دەکا بە قوەت دێت و هەموو ئەحواڵی ساڵح بە فەساد دەدا، بۆ ڕۆحی ساڵحیش قوەتێك هەیە دەچێت ئەو ڕۆحە شەریرە بکوژێت تاقەتی نایهێنێت، بۆ شەریریش لەشکر هەیە لەگەڵ ڕۆحی ساڵحدا شەڕ دەکەن و ڕۆحی ساڵح لەو شەڕەدا زەرەر دێنێت، ئەگەرچی قوەتی ڕۆحی ساڵح زۆرتریشە لەگەڵ ئەوەشدا دەرەقەتی ناکرێت لە پاش مردن ڕۆحی ساڵح پێشوازیی ساڵحان دەکا مەرحەبایی لێ دەکەن و دەیان بەنە شاری ئازادیەوە هەرچیکو شەڕیرن فڕێیان دەدەنە نێو چاڵاوی شەڕەوە لە شاری شەڕیراندا خواردنیان ژەهرەو ئاوی سوێرو تاڵە.

**( موغ کوهین )**

فەسادی ئاینیی زەردەشت لە موغ و کوهینانەوە (کاهینانەوە) هاتە پێشەوە، موغان لە پاش زەردەشت ئاورپەرستی و ئەستێرە و اجرام سەماوی پەرستیان تێکەڵ بە ئەحکامی ئاین و مەزهەب و دیانەتی زەردەشتی کرد، (خورافات و ئەفسانەیەکی زۆریان لە ئەسڵی ئاین وەردا) ئەویش لە ئیبتدای ئەمردا عولەما لەنێو کوردستاندا دەستیان بە تەداخولی ئاین و ئیشتیهاد لە ئوسوڵی دینیاندا کردبوو، بە دەسایسی (جولەکەکان) ئەو فیتنەی ئەفکارە لە کاردا بوو، بۆیان دەکۆشا و کەوتبوونە نیو میشکی موغانەوە بۆ ئەفسادی ئاینی زەردەشت موغ و عولەما تەسەلوتی مەعنەویان لە کوردستان پەیداکردو چوبوونە عەقلی عالمەوە (لە نیو ڕۆحی کوردستاندا دەستی ئیستیلایان دریژ کردبو لە تەرەف میللەتەوە ئیحترامات و تەعزیمیکی لە حەد بەدەریان بۆ دەکردن مەحبوب و عەزیز و مەسموعلکەلام بوون لەسەر حوکمداران بە تەواوی ئەمرفەرما بون مبەشیریان دەکرد بۆ حوکمدار بە عەفو. (حوکمدار ئینکاری نەدەتوانی بکا، پادشا جەسارەتی موخالەفەی ئەو موغانەی نەبوو، ئەو ئەشخاسانە دەستیان بە فەلسەفەی دینی کرد، پیسترینی عاداتی ئەو عولەمایانە ئەمەیە کە لە هەموو شتیك پی چاتر بوو (خودای مستی مسکراتیان دەبرد بە قوربانی) لە پاشان موغ شرابی دەخواردەوە تا ویژدان و ڕەوشت و عەقلی لە دەست دەردەچوو خەلقیشیان فیری ئەو عەقیدە فاسدانە کردبوو. سوجدەیان بۆ ئاوریش پی دەبردن.

خوڵاسە ئیعتیقادی کوردستانی قەدیم لە پیشودا لە هەموو ئیعتیقادیکی امم سائریەی شرق چاکتر بوو، چونکە بێ وەحی ئاسمانی تەشەبوساتی وەحدانیەتی خودایان کردبوو. لە سالی ٥٢١ ق. م (دارای گەورە) هجومی کردە سەر (سمردیس) و کوشتی و ئەو عەقیدە فاسیدەی لە کوردستاندا پاك کردەوە. ئەما بە دزی لەنیو هەندیکدا ئەسەری مابوو، دەیانشاردەوە باقی بە تەواوی دینی زەردەشتیان قبول کردەوەو دەستیان بە بینای دینی پیشوو کرد. (دارا) هەموو موغ و کاهینانی سمردیسی کوشت. عولەمای زەردەشتی خستە روو و ئیعتیباریکی تەواوی پیدان (مزدك) تا زەمانی نەوشیروان دینی زەردەشتی لە وجودا بوو، لاکین ئاوریان بە خۆشەویست قبول کردبوو و بە گەورەیان دەزانی، نەك بە مەعبودی بناسن، یاخود تەلەبی خەیرو شەریکی لی بکەن، ئەمما زۆریان بە عەزیز و مەحبوب کەوتبوە بەرچاو، ئەویش لە تەئسیراتی سمردیس مابوەوە.

لە زەمانی نەوشیروان عادل دا (مزدك) نیویك بانی و موئەسیسی دینی مەجوسی پەیدابۆوەو دیسان عەقیدەی فاسیدی سمردیسی تازە کردەوەو خستیە مەیدانەوە (ئوسولی ئیعتیقادی مزدك) هەرچیکو شەیتانە ڕۆحیکی شەریرەو تەواوی کۆشش و مەقسەدی ئیفسادی و روحی سالەحە. هەرچەند فیکری هەیە بۆ ئەو هەدەفە بەکاری دەبا بە (پەرستنی ڕۆژ و مانگ و فەرجی ژن و ئاورو مردوو ئەمری پیدابوون سوجدەیان دەبردە بەر (ئاور) و (نور) و (هوا) و (با)یان دەپەرست بە ئاوریان دەگوت جەسەدیکی پاکە، ئەگەر لە لای قوربان ئاوریان بگرتبایە نەیان دەکوژاندەوە، ئیعتیقادیان بە هاتنە خوارەوەی لە ئاسمانەوە دەکرد.

ئەو ئیعتیقادەیان بە نزولی دانابوو، تا زهوری ئیسلام دەوامی کرد، لاکین هەندیك لە کوردانی ئەتراف بەحری ورمیە لە عەسری چوارەم لە پاش عیسا عەلەیهی سەلام، بە واسیتەی یەکیك لە عولەمای کوردستان (ئاس) نیویکەوە، دینی مەسیحیان قبول کردبوو و لە زمان (خەسرەوی پەروین)دا کە لە دەست بەهرام چوپین هەڵاتبوو، هەندیك لە کوردان لەگەلی چوبوون بە دزیەوە دینی عیسایان قبول کردبوو تا دەرکەوتنی ئیسلام لەژیر ئەو ئیعتیقادانەدا دەژیان.

**سەرچاوە:**

غنچەی بەرهاستان، مطبعة العصر الجدید، حلب طبع سنة ١٩٢٥. حسین حزنی موکریانی (داماو)

**تیبینی:**

ئەم بابەتە لە سالی ١٩٢٥دا بلاوبۆتەوە، بۆیە چ لە روی نوسینی هەندێ پیتەوە و چ لە روی مانای کوردی هەندێ وشەوە لەگەڵ ئەمرۆدا جیاوازە. بۆیە بە مەبەستی ئاسانکاری دەستکاری هەندیکیمان کردوە.

# میجەر سون

حوزنی موکریانی

ئەم وتارە بە کورتی لە دکتۆر ج. م. لیز وەرگیراوە کە لە نامەی م. س. د ف. س. دا نوسراوە، وە لە ژور نالْ سترالّی ئینگلیزی فورمی ٣ دا سالّی ١٩٢٨ چاپکراوە.

دکتۆر لیز چونکە لە هەڵەبجە نایبی حاکمی سیاسی بوو، لەگەڵ میستەر سون ئیشی دەکرد، زۆر باش لە سەربهورد و چلۆنی و کردەوەکان و ئارەزوی میستەر سون ئاگادار بوو، لە ڕیزی دێرێك نوسینیدا بە هەڵکەوت لە میستەر سون دواوە، باسی لە کردەوە بە کەڵك و چاکەکانی کردوە. یەك بە یەك ئیشە پڕ سودەکانی میستەر سونی نیشانداوە.

دکتۆر لیز دەڵێت: مانگی مارت ساڵی ١٩١٨ مەندوبی سامی لە بەغدا لە ژێر چاودێری خۆیدا کۆمەڵەیەکی بەست، میجەر سون و میجەر نۆیل، کارمان لیچمان و چەند ئەفسەرێکی دیکەش لەو ئەنجومەنەدا کۆبونەوە، لە پایانی قسەدا لەسەر ئەوە بڕیار درا کە میجەر سون لە بری میجەر نویل بچێتە سلێمانی، ئیشوکاری سیاسی لەوێ بگێڕێ و دکتۆر لیز بە معاونی سیاسی بچێتە هەڵەبجە یارمەتی میجەر سون بدات، لەو بابەتەوە گەلێك دوان، باسیان لە هەموو شتێك کرد، ئەوجا هەر یەکە بۆ سەر وەزیفەی خۆیان چوون. میجەر سون چوە سلێمانی، دەستی کردە ئەو کاروبارەی کە پێی سپێرابوو و خەریکی پێکهێنانی ئەو فەرمانانە بوو کە بۆی دانرابوو.

مانگی تشرینی دوەم ساڵی ١٩١٩ میجەر سون وەڵامی دا بە مەندوبی سامی کە وڵاتی سلێمانی کەوتە ڕێکوپێکی و نیزام پەیدا کردنێکی وا کە هەموو میللەتەکەی پێی دڵخۆشن و شادمان و بە کەیف و ئاسودە و دڵنیان و بە ئازادی، قانون بە هەموو لایەکدا فەرمانڕەوایە.

میللەت لە خۆشی و پێشکەوتندان، دەرگای واریداتی بۆ کراوەتەوە، مالیەی پتر کراوە بازرگانی، جوت بەندەیی، دان و بستان ئازادە، بێ ترس و لەرز هەرکەس خەریکی کردو کوشەی خۆیەتی. کڕین و فرۆشتن، هاتووچوون و کاروان، بێ ئەندێشە لە کاردان.

دکتۆر لیز دەڵێت: میستەر سون. لە عەدالەت و دادگوستەری و ڕەعیەت پەروەری لای نەدەدا. دەستی سەرکێشان و زۆردارانی لەسەر بێ دەستەڵاتان بڕیبوو، دزو تالآنگەرو ڕێگرانی نەهێشتبوو، هەموو بەدخواهێکی لە کردەوەی خۆیان پەشیمان کردبوەوە، لە پیسی و خراپی نائومێدی کردبوون، چەکی بە دەست پیاوخراپانەوە نەهێشتبوو.

میستەر سون لەو چەندانەی کە لە سلێمانی بوو بناغەی گەلێك کاری چاکی دانان و گەلێك ڕەوشتی پەسەندی خستە نێو دانیشتوانەوە، ئەو جۆرە شتانە ببوون بە مایەی ئەمە کە هەموو کوردێك خۆشیان بوێت و ناوی پەسەند و جوانی بە هەموو وڵاتی کوردستاندا بڵاوبێتەوە و سوپاسی کردەوەو بیرەوەریە چاکەکانیان دەکرد.

یەکێك لەو شتە پەسەندانەی کە دایمەزراندن، دەرهێنانی گۆڤارێکی هەفتەیی بوو بە زمانی کوردی کە ناوی "پێشکەوتن"ە و بۆ چاپکردنی ئەو گۆڤارەو کتێبە ئەدەبیاتە کوردیەکان لە سلێمانیدا دانانی چاپخانەیەك بوو. لەودەمەدا ئەهالی سلێمانی و عولەماکانیان، بە سوکی و ئەتك و گەمە لەو گۆڤارە دەدوان، لە ئەنجومەناندا ناویان دەبرد. میستەر سون هەڕەشەی لەوانە کرد، وە بە زۆر ناچاری کردن بیخوێننەوەو بە پیرۆزی بزانن. ناچاری کردن کە دەبێ هەموو کەس بیکڕێت، بەو جۆرە تێکۆشا تا خوێندن و نووسین و چاپکراوانی کوردی لە جێگای فارسی و تورکی باو بگرێ و بخرێتە کارەوە، بەو جۆرە لە سلێمانیدا خوێندن و نوسینی کوردی خستەکارەوە.

لە سلێمانیدا تا ئەو دەمە هیچ قاقەزو نامەیەك بە زمانی کوردی نەنووسرابوو میستەر سون بە زۆر باوی پێدا، عولەماو شێخەکانی سلێمانی وتبوویان وشەکانی کوردی گرانن نایەنە نووسین. میستەر سون پێی نیشاندان و بۆی ئاشکراکردن کە کوردی زۆرباش دەنوسرێ زمانی کوردی بە ئاسانتر تەرزێك دەخرێتە سەر قاقەز، وە بە چاکترین دڵخوازێك دەنووسرێتەوە.

میستەر سون وشە کوردیەکانی کۆکردنەوە، فەرهەنگێکی بۆ دانا، قاقەزو نامە ڕەسمیەکانی حکومەتی کردە زمانی کوردی، ڕەسمیات بوو بە کوردی، معامەلە، عەرزوحاڵ بە کوردی نەنوسرابا قبوڵی نەدەکرد. بەو جۆرە زمانی کوردی لە سلێمانیدا پەرەی بەست و دامەزراو هەرکەسێك نامەیەکی بە کوردی پەتی بنوسابایە، بەخشیشی پێ دەدرا. بەو گۆڤارو نامەو قاقەزانە بەرە بەرە زمانی

کوردی نووسینەوە پیشخراوە بۆ مەتبوعاتی کوردی بناغەیەکی چاك و بەتین دامەزراندرا.

دکتۆر ڤیگرم لە نووسراویکی خۆیدا دەلیت: میجەر سون لە سلیمانیدا گەلیك لە جاران تەنیا ماوەتەوە بەلام لەبەر قابلیەتی زاتی خۆی و جەوهەر ئازایەتی ویژدان پاکی و کردەوە چاکی خۆی، کورد زۆریان خۆشویستوەو لەگەڵ ئەوەشدا میستەر سون ئاگاداری رەوشت و مەزاج و خوی کوردەکان بوە، زۆرباش تییان گەیشتوە، بزوتن و ئیشوکارو کردەوەی هەموانی زانیوە، شارەزای بەسەر هەموو سوران و جولانەوەیەکیاندا بوە، جا لەبەر ئەوە لە دەستی دەهات و لە شانیدا بوو، زۆر بە باشی و بێ خۆماندوکردن هەموو کوردستان بخاتە ژیر فەرمانی حکومەتەوە. کوردەکانیش شایستەی ئەوە بوون کە زۆر باش بروا بە میستەر سون بکەن و پیی دلنیابن.

دکتۆر لیز دەلیت: من تا سالی ١٩٢١ لە هەلەبجە مامەوە، بۆ دیدەنی ولاتەکەم ئیزنم وەرگرت، کاپتان ا. ژ. دەگلیز لە جیگای من دانرا، منیش لە دۆست و دەستە براکانی کورد پچرامەوەو چووم، دەستم لە کوردستان بەردا. میجەر سون. لە مانگی نیسانی ئەو سالەدا گەیشتەوە ئینگلستان و چوە نیشتمانەکەی خۆی.

**سەرچاوە:**

دەنگی گیتی تازە، ئاغستوس ١٩٤٥

ژمارە– ٥ بەرگ– ٤

گۆڤاریکی مانگانە بوو، لە لایەن بەشی پەیوەندیی گشتیەوە، لە بالیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا، دەردەهینرا.


پێشکەوتن


دەنگی گیتی تازە





# جارێك ڕاستم كرد

حوزنی له عەرەبییەوە وەریگێڕاوە

ڕۆژێك مامۆستام بۆ كتێبخانەكەی بانگی كردم و پێی وتم: ئەمڕۆ ئیشێكت پێ دەسپێرم، زۆر بە گومانم كە تۆ ئەوە پێك بێنی.

—بۆ من هیچ لەوەدا جێگای نیگەرانی نیە. تۆ دەتەوێ بۆ هەیوان سەركەوم یاخود بۆ ژێر هەموو ژێرخانێك بچمە خوار یا، یا؟

بە سەر هەژاندنێك ڕای گرتم و وتی: (نا، هیچ لەوانە نیە، بەڵام ئەوەی كە من لە تۆم دەوێت بە جێی بێنی ئەوە ئەمەیە كە ڕاست بكەی و ڕاست بڵێی هەرچییەكی بیرەوەری لێ بكەیەوە ئەوە بڵێی"

كە قسەكانی مامۆستام بیست بە گرین قسەی كراوەم لێ خواست و هەڵیدایەو وتی: "لەم بەیانیەدا دەردەكەوێ و ئێوارە دەگەڕێیەوە، بۆ كوێ دەچی بچۆ، هەرچۆنێك دەتەوێ، بێجگە لە تەنیا شتێك بەولاوە هیچم لەتۆ ناوێت ئەویش ئەمەیە كە ڕاست بڵێی، ڕاست، هەردەمی كە لەگەڵ ئەم و ئەوا قسە دەكەی و ئەم و ئەو قسەت لەگەڵ دەكەن، قسەبازی دەكەن و قسەبازیان لە تەكا دەكەی، لەگەڵیاندا دەڵێی و لەگەڵتا دەڵێن جا چی لە سەرەڕێیاندا بێ و چی لەلای دۆستان بێ، یا دڵت دەخوازێ لەگەڵ هەر كامێك. برۆ بچۆ..

ئەوانە هیچیان لە ڕۆژانی مندا نین وەدوویان كەوم: دەڵێم و بیری لێ ناكەمەوە وە نە لە هی دیكەش!..

من لە كتێبخانەكەی خۆم دەركەوتم كە ڕۆژەكەم بە خۆشی بەسەر ببەم، هەر لەودەمەدا بە ڕاستی بیرەوەی و گومانم خراپی هێناپێش، ئەمەیە بۆت دەگێڕمەوە:

ڕوم لە خۆشترو خوان تر گەڕەكێكی شار كرد، بەسەر كوچە شاریەكەدا دەچوم یەكەم كەسێكی هاتە پێشم موئەلیفی بەناوبانگ.. بو.

—ها ئەوە تۆی چۆنی چاكی خۆشی؟ ئەوەی وت و سەلاوداو دەستی بۆ درێژ كردم كە بیگوشم.

وتم باشم، زۆر باشم سوپاست دەكەم و چاكی و خۆشی ئێوەشم دەوێت. بەڵام پەیمانی خۆمم وەبیر هاتەوە، مەرجەكانی خۆم خستەوە بیر خۆم و ڕووم لە نەفسی خۆم كرد خۆبەخۆم وت:

"كەی ئەمە وایە كە باشم زۆر باشم؟ هیچ وانیە، پێویستە كە لە قسەی خۆمدا ڕاست بكەم" لە وتندا پەلەم كردو هەڵم دایە: هەستی كەمێك سەرئێشەی سوك دەكەم لە سەرمدا.

—تۆ گەلێك ئیش دەكەی و زۆر ماندو دەبی.

—ئەوە شتێكی ڕوودراوە.. ئاخ.. هیچ وانیە، هیچ وانیە، بەڵام توتن زۆر دەكێشم. لە یەكەم هەنگاودا لە ڕاست وتندا ڕێگای ڕاست وتنم گرت، هەنگاوی ڕاستیم لە گەڵیا هاوێشت.

—هیچ تەئلیفەكانی منت خوێندونەتەوە؟

—بێگومان.

چۆنت دیین؟ بە ڕاستی زۆر چاكن دەنا وانیە؟

هەندێك دامام و بیرم كردەوە دڵی خۆم ئازا كردو هانی خۆم داو وتم: تەئلیفەكانت؟ دەبێ كە تۆ ئارەزوت ئەمە بێ لە دڵخوازی من بگەی، بە ئاشكرا پێت دەڵێم كە بە ڕاستی شتی قۆڕن، ئاوەیە باوەڕیم، لە بابەت هەرچییەكی تۆ نوسیوتەتەوە.. وا بزانم وە بیرت دێتەوە كە من چەندە پێم داهەڵگوتون و سوپاستانم كردوە، لە كۆمەڵەكاندا وتومە كە تۆ جێگای سەربەرزی میللەت و شانازیانی، وە میللەت دەبێ بە تۆوە بنازێ و شانی بە تۆوە بڵند بكات، بەڵام باوەڕی من بە تۆ ئەمەیە كە تۆ پیاوێكی هیچی و دزی، لەو دزانەی ئەدەب و هونەری، هیچ شتێكی وا نیە بەرامبەری پوچیت بگا، تەنیا بە خودا خورین نەبێ.. موئەلیفی گەورە پشتی تێكردم و ڕوی لێوەرگێڕام و ڕقی هەستاو توڕە بوو نێوچاوانی گرژ كرد.. بەڵام من هەناسەی خۆم كێشاو ناو دڵی خۆم بەرەڵا كردو فویەكم لە هەوا كرد. هەر ئەمەم پێوت كە لەوم دیبوو، تێی گەیشتبووم و هەندە. هەتا دوامین بەم سەركێشیە خۆ دەگرم ئیش بە هەر جۆرێك لەوەوە دەگاتە ئەنجام با بگا، ڕاستی چی بێت ئومێد دەكرێ كە خۆی بنوێنێ و ئاشكرابێ.

لە پاشان دەستی بە ڕۆیشتن كرد، منیش لە هاتوچوونی دەستە براو دۆستان خۆ دەپارێزم كە نەكو ئەو ڕاست وتنەی من، لە من ڕقیان هەستابێ و دڵگیرو توڕە بن، بەوە پێم لە هاتوچوو بڕی، وە كام دەستە برای خۆشەویستی دڵسۆزم كە هەبوون بەرم دان و خۆم لێ دوورخستنەوە كە ڕازو گلەیم لێ نەكەن و بە سەرزەنشت دام نەگرن و سەركوتی زمان درێژی و گازندەم نەكەن.

چومە ئاشخانە (مطعم). پیشكار هات قاپوتەكەی لەبەر داكەندم و بە قولاپی دیوارێكدا كرد، بە هێمنی پرسیاری كرد كە لەبەرچی چەندێكە دیارنیم و ناچمە نانخواردن.. وتم: لە هاتن پێم بڕێ.. بەڵێ بێگومان نەدەهاتم.. لەبەرئەوە كە دراوێكی لە دەستم دا بوو هەر هەندە بوو بەشی خواردەمەنیەكەم بكات نەك بەشی بەخشیشی كرد با كە هەموو ڕۆژی بدەم. لە پاش ئەوەش من خاوەند نەیارو دوژمنم كە ناوی ئەویش بەخشیشە، باوەڕی من ئەمەیە هەر كەسیك، هەر پیاویك، بەخشیش.. كە بەخشیشی

وەرگرت لە کۆمەڵەو یەکایەتی مرۆڤ دەرکراوەو کەم ترە لە دەروزەکەرەکان، وە لە فرۆشەرە گەڕۆکەکانی کوڵانەکان سوکترە.

"دەمەویست بە پێی باوەڕی و دڵنیایی خۆم بدوێم و قسەکەم بە پایان بگەیەنم". (لەو دەمەدا پیاوێکی بەدڕەوشت.. پەست، خوو خراپ.. کەم هەست.. بێ ڕوو.. بێ شەرم.. نێوچاو ڕەق.. کەللە سەر ئەم و ئەو دەژیا.. بە.. دەژیا.. بە.. بە.. دەژیا، بە دەروزە دەژیا، منیش کە ناچار ببووم چووبوومە ئەو جێگایە کە دۆست و ئاشنا توشم نەبن و تووشی قسەم نەکەن و دەرگای قسەم لەسەر خۆم گرێ دابوو ئەگەر من بەخشیشت بدەمێ بە خۆشی خۆمت نادەمێ، زۆر ملی پێم دەدات، دەبێ بە پێی ڕەوشتە ئاشکراکانی درۆ بە ڕێدا بڕۆم، ئەویش ڕێگایەکی ئەوتۆیە کە ناچارمان دەکا کە درۆزن بین. کە سەرم هەڵێنا پێشکارەکەم نەدی و لەوێ نەمابوو، تومەز من خۆ بە خۆم قسە کردوە، پێشکارەکە خراپ بوو، کە دراوی خواردنم دا کەسێك هیچ یارمەتیەکی نەکردم خۆبەخۆم لە قاپوتەکەم پرسی.

بەبێ قاپوت دەرکەوتم لە دڵی خۆما وتم جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە..
لە دەرەوەت دەوت مام (مادلین) توشم بوو گەورە کچێکی شۆخ و شەنگی گەلێك جوان بوو، بەڵام زۆر بە خۆی ناز دەکرد.

لە دوای ڕۆژباش، پێم وت: هەی مادلین گوێ بدە من، تۆ ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو گەورە بوون دەچی، ئەوانەی لە تەمەنی تۆدان ناتوانن خۆیان بەو گەورە کچە تازە پێگەیشتوانە بچوێنن کە لە تەمەندا ناسك و شلك و تازە هەڕەتیانە، چونکە مێینە کە گەیشتە تەمەنی ٢٥ بە قەیرە کچ دادەندرێ.

بە توندو تیژێکەوە قسەبڕی کردم و هەڵیدایەو وتی: هێشتا من نەگەیشتومەتە تەمەنی بیست و پێنج وا لە ساڵی بیست و یەکدام.

وتم: چۆن؟ وا بزام تۆ باشی دەزانی کە من چوار ساڵ لە تۆ گەورەترم، ئیدی بۆچی درۆ دەکەی؟ لە ڕووتا نیشانەی گەورەیی زۆر باش ئاشکرایە.

مادلین سوورهەڵگەڕاو گرژ بوو کە ئەوانەی لە من بیست وتی: وست هەی گێژی هێری گەوجی تێنەگەیشتووی بێمێشك، هەی درۆزن.

—درۆزن، نا.. ئەمن هیچ قسەیەك ناکەم کە کردم دەبێ ڕاست بێت، وەنەبێ باوەڕیشم هەبێ کە هەر بەمەندە ڕاوەستم.. تکا دەکەم و لە بەرت دەپاڕێمەوە لەم دەمەوە دەنگم لێ بگۆڕە ئەمن چی دیکەت ناناسم.. بە ڕق و تووڕەییەوە ڕۆیشت.

سەیرە، سەیرە، زۆر سەیرە! بۆچی هەرکەس ڕاستی بیست ڕقی هەڵدەستێ و کەس ڕاستی خۆشناوێ، ئەوا من دوت مامی خۆم تورە کرد. خوێن لە سەرما فڕکەی بەست، جوینم بەم چاو پێکەوتنە ناهەموارە نەگبەتەدا.

هەر لەودەمەدا یەکێکم توش بوو (نیبانی) دەیەویست پاڵم پێوەدات بۆ ئەوە لە دڵی خۆمی ئاگادار کەم و باوەڕیەکەی خۆمی بۆ ئاشکرا کەم، هەرچەند ئەو ئاشکراکردنە بۆ ئەو پێویستێ بوو، وە بۆ منیش دوامینکی پێوە بوو کە نە سوپاس بکرێو نە ئاسودەیی تێدابێ، بێدەنگ بەجێم هێشت و ڕۆیم و ڕێگای خۆم گرتە پێش. زۆر دورنەکەوتبوومەوە هەر هێندەم دی توشی "دوران"ی پیاو خراپ بووم. ڕۆژێك لە ڕۆ ژان پیاڵەیەك نەبیزی زۆر چاکم پێدابوو زۆری لێکردم چوار سەنتیم پیاڵەکەم بۆ پڕ کرد. لەو ڕۆژەوە دەگەڕام کە دەرفەتم دەست کەوێ ئەو تۆڵەیەی لێ بکەمەوە، کە هەردەمی دەیبینم ئەوەم وەبیر دەکەوێتەوە ڕقم هەڵدەستێ کە ئەو سوکییەی پێکردم.

—ڕۆژباش هەی گەوجە. لێت ناپرسم چۆنی چونکو سوکییەکت پێکردووم ڕۆژێ، ئەوەش لەلای من شتێکی وانیە، تۆ گەلێك لەوە خراپتری کە ناسیومی، گەلێك جاران بە خۆشەویستی ڕۆژباشیم لەگەڵتا کردوە بەڵام ئەوە ڕەوشتێکی ئەوتۆییە. بەڵام ئێستا لەوانە نیم، بێجگە لە ڕاستی بەچی تر دەم ناکەمەوە. "ڕاستی، تەنیا هەر ڕاستی".
"دوران" تورە بوو ڕقی هەستاو ڕووی لێ گرژ کردم و ڕۆیی و چوو، بۆ دەستەبراکانی دەگێڕاوە، کە تووشی من بوەو منیش بە قسە شەرمەزارم کردوە.

نە دڵگیر دەبم وە نە بەتەنگ هەڵدێم چونکو دەرفەتم بوو، هەلم بۆ هەڵکەوت توانیم تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە. لە دوای ئەو دیدەنیە سواری پاس بووم، کە دیم وا پیاوێك زۆر بە ئەزیەت و گرانی سەردەکەوێ و لە تەنیشتم دادەنیشێ.

لە پاش دانیشتن ڕوی لە من کردو وتی: خواهیشت دەکەم جێگام پێ تەنگ نەکردبێ.

—ببەخشە، تۆ جێگات پێ تەنگ کردووم و لە پایەپتر تەنگەمت هەڵچنیوە، نازانم چۆنت بەم جۆرە بۆ سواربوون ڕێ ئەدەن. بە تایبەتی چۆن فیلی وەکو تۆ سواری پاس دەکەن.

دانیشتوەکانی پاس هەموو دەستیان بە تریقەی پێکەنین کرد، بەڵام لە کاکی زگ زل نیشانەی ڕق و تورەیی لە نێوچاوانی پەیدابوو. لە پێش دەممەوە لاچاوکێکی جوانی دیمەنی شۆخی زۆر بە خودا خەریك بوی و بەرگ و سەرو روو خاوێن دانیشتبوو،

وام هاتەوە بیر کە من ئەو ڕوە بناسم، من لەوەدا بووم و تەماشاییم دەکرد بە پرسیارەوە کە دەبێ کێ بێ و لە کوێم دیبێ و چی بێ.. پێی وتم:

—باوەڕ دەکەی کە دەمناسی؟ ئێستا، هەر ئێستا دەتناسم.

—زۆر دوورە، هیچ وانیە.

—بەڵێ تۆ منت بەو (دزەی) هەفتەی ڕابردوو، وەبیر دێتەوە، هەر کە ئەو کوڕە ئەو قسەی دەست پێکرد. یەکێك لە دانیشتوەکانی پاس نەمانەوە کە تەماشای ئەو لاوە نەکەن بە تەماشایەکی گومان. یا خاوەند هەڵگری دراوێکی بێ ژمار، یا قاپوت کراوەیە نەکەن. بەڵام لاوەکە کە بە ڕاستی لە شەرمان ڕووی سوورهەڵگەڕا.

پێی وتم دڵ پیسیە کە لە منی دەکەی دەبێ پێکەوە لێکی بدەینەوەو بیخەینە ژمارەوە ئەمە پەتە (بطاقە)ی منە وەریگرە وە پەتەی خۆت بدە بە من.

—ئەگەر هەڵم گرتبایە بە ئارەزوی خۆم پێم دەدای، بەڵام بۆ گوزەرانم دەست نادا کە لە پێش پایایی مانگدا تا جیرەی مانگانەم وەرنەگرم پەتە چاپ بکەم. لە پاشان بە ئەسپایی لە سەرخۆ دابەزیم و چومە کتێبخانەکەی خۆم.

لە ڕێگا کە دەچووم بیرم دەکردەوەو خۆم بە خۆمم دەوت هەیاران، گەلۆ، داخوا، ببوە، یا دەبێ لە دژواران و شتی سەخت بێ لەسەر مرۆڤ کە لە وتن، قسەی ڕاست بکات و لە پێش بیر لێکردنەوەیدا بڵێت، چونکو ڕاستی گەلێك کەس برینداردەکاو دڵی زۆر مرۆڤان دەشکێنێ، بە ڕاستی دڵی ئەو جۆرە کەسانەی کە ڕاستی پێ دەڵێیت و ڕاستی لەگەڵ دەکەی چاکتر دڵی بریندار دەبێ. هەر وەکو هەندێك شت لەو شتانەی کە لەم ڕۆژانەدا تووشی بووم و لەگەڵ گەلێك کەسا دووچار بە دڵشکاندن، زویر بوون و توندی و تیژی بووم کە دیم.

کە وام کەوتە بیرەوە، لە چوین پەلەم کردو خۆم گەیاندە کتێبخانەکەم، دڵنیا نەبووم بچمە ژوورەوە تا دەرگاکەم، توند گولە (قفل) کردو لەسەر خۆم بەست و دامخست ئەوجا پشویەکم هاتەوە بەرو هەناسەیەکم هەڵکێشا.

ئا ئەوەتا من لێرەم لە پاشان لە ژورێکدام هیچ کەسم نیە کە ئەوی بیری لێ بکەمەوە پێی بڵێم. بەڵام لەم دەمەدا زەنگی تەلیفون لێی دا زوو چوومە سەر ئامرازی تەلیفون. ئەوە کێ بوو؟ مامۆستاکەم بۆ خۆی بوو، لێی دەپرسیم:

—هۆ ئالو ئەوە تۆی؟ ئاخ زۆر چاك بوو.. گەڕامەوە.. ئەو ڕۆژی کە پێم وتی ئەوەت کرد؟ وە ئەو وتارەی کە لەو بابەتەوە لێم خوا تبوو دەبی نووسیبێتت؟

وا ئەوەی لەمەپێش پێم وترابوو لەوەوە: بەڵێ" یا "من لە لێ دوانیدا گوناه بارم" بەڵام ئەمڕۆ هەتا هەتا وابەستەتانم، پێم وت: نا، هیچ وانیە.

—کەی پێك دێت؟ دەنگە کە وتی.. ئەمن بۆ خۆمم هیچ پێنازانم.

مامۆستا وتی: ئەمە باسێکی ئاشکراو ڕوونە، دەنا وا نیە؟

وتم: نا، دوورە لەوەی کەوابێت.

بە تەواوکردنەوە هەڵیدایە: دەبێ پێویست بێ کە تۆ لەوانە بی سوپاسم دەکەن. چونکو هەر چیکومنم ئەو بیرەوەریەم پێداوی، کە دەرچی، وە نەڵێی هەرچیەکی دەیڵێی دەبێ ڕاست بڵێی، هەر ڕاست، تەنیا هەر دەبێ ڕاست، بۆ تۆ هەیەو دەشیەی لە خۆتدا وا ببینی کە هەر چۆنێکی مرۆڤ هەستی پێ دەکەن بە خۆشیەوە، لە دەمی کە دەڵێن بیرەوەری لێ ناکەنەوە..

هەرچەند ئەگەر لە تەمەنی ژیاندا جارێکیش بێت..

ئا ئەوە شتێکی وابوو کە لە هەڵگرتندا نەبێ.

بە پەلە دەستبەجێ وەڵامم داوە "شتێکی ڕاست وایە" بەڵام لێرەدا شتێکی وا هەیە کە هێشتاش لەگەڵ بیرلێکردنەوەی خەریکم، دەبێ بیڵێم تا من لە سەری، خۆ بە ڕاست تێبگەم، تا هەتا هەتا دەبی هەر بیڵێم: ورد بەرەوە، وام دێنە بیرەوە کە تۆ دامەزرێنەرێکی مرۆڤی ون کەری، ستەمگەر، بە ئارەقەی ژێردەستەت و کرێکاری خۆت، گۆشت و بەزو پیوی خۆت پڕدەکەیەوە، هیچ کارێکت لە دەست نایەت، وە لەگەڵ ئەوەشدا سەرمایەو سامانێکی زۆرت پێکەوە ناوە. لە دوای هەموان دەگەیە مەکتەب و لە پێش هەموانیدا بۆی دەردەکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا من هەمیشە دڵتم ڕادەگرت و سوپاستم دەکردو پێتمدا هەڵدەوت، بۆ بەرەی ئیشی خۆم، دەنا من ڕقم لە تۆیە، تۆ لەوانە دێت ژمارەوە کە پێیان دەبێژرێ گوناهکار، ڕێگر، تۆ دڕندەی پەلامار بەری، تۆ، تۆ..

—بەسە بەسە، مامۆستام قیژاندی. تۆ ڕەتی (جرا) ئەمەت برد کە ئیشی وام لەگەڵا بکەی! من تۆ دەردەکەم، ئیتر بۆ دەرکردنت ئیش گەیشتە پایان، هەی پەست، هەی ناکەس بەچە، جارێکی تر ڕووی بەدچارەی خۆتم نیشان نەدەی، ویستم کە ئێستا چەرخە چوپانێکت پێ بکەم و چەرمەسەرەدت دەم، بەڵام پێك گەیاندن ئەوا پسا.

تەماشا بکە لەوە کە دەمەویست بیرەوەری تێدا بکەم چی بەسەرهێنام، کە قسەیەکی بە بیرەوەریەوە کردم، چۆنی سوودمەند کردم.

هەموو دۆست و دەستە براکانم بە تورەیی دەست لێبەردان لێم دوورکەوتنەوە، هەتا ئەو مامۆستایەی کە لێی فێر دەبووم و ئەم بیرەوەریەی خستە مێشکمەوە، لەبەرئەوە کە ئەوەی دەموت بۆیم ئاشکراو ڕووناك کرد، دەستی لێهەڵگرتم و دوورکەوتەوە.

ئا ئەوەی لە قسەی ڕاست دەستم کەوتبی و سودیم لێ وەرگرتبێ، ئەوانە بوون، ڕاست تەنیا هەر ڕاست!، ئەوە سودم بوو!.

**سەرچاوە:**

**زاری کرمانجی**

هەندێك لە كارە زەنگۆگرافیەكانی ( حوزنی )



﴿ ڤینه ی عمر آغای خزینه داری ﴾
ـ آورحمان باشا ـ



﴿ وینه ی محمد حسن خانی قاجار ﴾



﴿ وینه ی سه رگرده یکی آورحمان باشا ﴾
ـ سه رگرماری جاف میر ویگه ـ

# حسێن حوزنی کۆڵەر

قادر میرخان

ئەوەی نزیکی دونیای ئەدەبیات و کتێبە، حسێن حوزنی موکریانی وەك نووسەر و خاوەنی چەندین کتێب و بڵاوکراوە دەناسێ و وەك کەسێکی شارەزای بواری چاپەمەنی ئەو سەردەمەی دەناسێ.

گەر چاوێك بە بەرهەمە چاپکراوەکانیدا بخشێنین لایەنێکی فەرامۆشکراوی بواری چاپەمەنی ئەو نووسەرەمان لا ئاشکرا دەبێت کە زۆر جیاوازە لەو کەسانەی تری ئەو بوارەی چاپخانەی کوردی، ئەویش دونیای کلێشەو وێنەو فۆتۆ و زەنگۆگرافە، کە شوێن دەستی لەو بوارەدا ئاشکرا دیارە.

هەر ئەویشە لە ساڵی ١٩٣٥ کتێبی (وێنەگەری و کۆڵین بە کردن و کۆشین و دیتن) تایبەت بە زەنگۆگراف ی بە چاپ گەیاندوە. کە بۆ ئەو سەردەمە دەستپێشخەرییەکی دانسقە بوە. بە تایبەت بۆ ئەوانەی لە بواری چاپەمەنیدا کاریان کردوەو لە بەر کەمی زانیاری و ئەم پسپۆڕیەش، بایەخی ئەم کتێبە، نەزانراوەو پراکتیزە نەکراوە. تەنانەت تاکو سەردەمی چاپەمەنی لەتەرپرێسیش، کاری زەنگۆگراف لە دەوری کوردستانی باشوور ئەنجام دراوە. لە شاری سلێمانی تاکو ئێستاش کە چاپی لەتەر ئەو بایەخە هونەری و پیشەسازییەی نەماوە، وێنەو کلێشەکانیان ناردۆتە بەغدا تاکو بیکەنە زەنگۆگراف.

وەك خۆی لە پێشەکی کتێبی وێنەگەری و کۆڵیندا دەڵێ:



"پیشەی منیش چونکە مۆر کۆڵان بوو لەسەر خۆم بە پێویست زانی هونەری کلێشەو کۆڵین بە ڕووناکی فێربم". ئەمە دەریدەخات پێش ئەوەی خۆی لەم بوارەدا ببینێتەوە دەست ڕەنگین بوەو مۆری هەڵکۆڵیوە. گشت بەرهەمەکانیشی ئەو شوێن دەست و پەنجانەیان پێوە دیارە کە چۆن بە کلێشەی وێنە و نەخشەکان نووسینەکانی دەوڵەمەندتر کردوەو ڕەونەقێکی تری بە چاپەمەنیەکان داوە.



هەر ئەو کاریگەری کۆڵینە دەستییەی لە سیمای کارەکانیدا دەبینینەوەو لەگەڵ ئەو توانا کەم و کورتەی ئەو سەردەمە بەو هۆکارە سەرەتاییانە دەبینین چۆن وێنەی کلێشەکانی هەڵبژاردوە. من لەم چەند دێڕەدا تەنها باس لەو وێنەو کلێشانە دەکەم کە وەك کەرەستە بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکان خستونیەتە کتێب و چاپکراوەکانیەوە، جگە لە هەندێ کلێشەو وێنەی بەڵگەنامە و مێژوویی، هەندێکی تریش وەك توخمی ڕازاندنەوە لە چەند جێگایەکی چاپەمەنیەکاندا بڵاوکردۆتەوە.

ئەو بە پێی ئەو قسەیەی کە هەر لەو پێشەکیەدا هاتوە: "هەر کەسێك دەست بە وێنە کۆڵین بکا دەبێ زۆر چاك فۆتۆگراف بزانێت، چونکە کۆڵانی بە تیشك و وێنەگەری (فۆتۆگرافی) زادەییکن.." ئەمە دەیسەلمێنێت کە تاکو چەند لە فۆتۆگرافەوە نزیك بوەو کاری لە ئیشی کۆڵینەکانی کردوە.

گشت وێنەکانی وەك هۆکاری ڕونکردنەوەی بابەتەکەی لەو کتێبەدا ئامادەی کردوە، کاریگەری مۆرهەڵکەندیان بە سەرەوەیە کە چۆن ڕاستەوخۆ ئەو پلێتە هەڵدەکۆڵێت کە بە مەش تا ئاستێکی زۆر لە گرافیك نزیك بۆتەوە شێوەی هێڵ و بۆشایی ئەو هیڵە کۆڵراوانە و ئاراستەی چەقۆی کۆڵینەکەو سوود وەرگرتنی لە ڕووناکی و تاریکی، بوونی پەرزپەکتیڤ لە وێنەکاندا و.. هەموو ئەمانە بە مەبەستی کاری هونەری گرافیکیش ئەنجام نەدرابن و یا وەك کاری گرافیك لەسەر کاغەزی تایبەت بە هونەری گرافیلك و شێوەی چاپکردن و جۆری مەرەکەب و ژمارەی چاپ و..هتد، نەبووبێ بەڵام سیمای ئەو هونەرە زۆر بە ئاشکرا بەسەر وێنەکانیەوە دیارە. هەموو ئەوانە وەستایەتی و شارەزایی بواری کۆڵینی ئەو دەردەخەن جگە لە توانای وێنەکێشانی.

توخمەکانی وێنەکێشان هەندێکی لە خودی ئامێرو کەرەستەکانەوە هێناوە کە ئەم باسی لێوە کردوون و وێنەکەیانی گواستۆتەوە، ئەوانە لە لایەك کەرەستەو ئامێرەکان دەنوێنن، لە لایەکی دیش جوانی هێڵ و شێوە هونەری گرافیك. لە شێوە کۆڵینەکانیدا گەلێ سیمای گرافیکی هونەریی لەخۆ دەگرن بۆ نموونە وێنەی (٨) دارشتنی کۆلۆدیۆن لە لاپەڕە (٣٥)ی کتێبی وێنەگەری و کۆڵین، گەر لە دەستەکان وردبینەوە لە پێناو




بەرجەستەکردن و دانانی سێبەردا کۆمەڵێك هێڵی لە دوایەك و تەریبی کورتی لە سنووری دەست پەنجەکانی کەلەوێنەکەدایە بە دوا یەکدا داناوە بەمەش گیانی کۆڵینی هونەری گرافیکی بە هۆی مسەوە ی تیا دەبینرێتەوە، دەبینین چۆن میانەی هێڵێك و هێڵێکی تر وەك یەکەو ئەستووری میانەیان چ ڕتمێکی وەرگرتوە. ئەمە لە کاتێکدا کە دەیتوانی مادام ئەوە تەنها وێنەی ڕوونکردنەوەیە، ئەو سێبەرانەی بۆ نەکات.

پیم وایە هەر کەسیك بیەوێ لە سەر میژووی هونەری گرافیك* ی لای خۆمان بنووسیت ناکریت کتیبەکان و هەولەکانی حسین حوزنی فەرامۆش بکات. ئەو دەست ڕەنگینە هەولی داوە چاپکراوەکانی بە کلیشە دەستیەکانی دەولەمەندتر بکات.

گەر سەرنجیك لە بەرگی (وینەگەری و کۆلین بە کردن و کۆشین و دیتن) بدەین جگە لەو دوو وینە کۆلراوەی سەر دوو بەرگەکە کە ناوەرۆکی کتیبەکە دەردەبریت هەر شیوەی دانانەکەی بۆ خۆی جۆرە دابەشکردن و سەلیقەیەکی دارشتنی تیایە، و ناوی کتیبەکەشی بە خەتیکی فارسی کۆلیوە بە سوودوەرگرتن لە پیتی چاپ کە پیکەوە دایرشتونەوە، ئەم نووسینانەشی کە لە شیوەی هونەری خۆشنووسیدا ئەنجامی داون لەگەڵ وینەکاندا لە زۆر بەرهەمیدا دەبینرینەوە.

گەر سەیریکی (غونچەی بەهارستان) بکەین هەر لە بەرگەوە لە تایتلی کتیب و ناوی نووسەر کە کلیشەیەکی خۆشنووسی جوانی بۆ ئامادەکردوە هەتا لاپەرەکانی، و ناونیشانەکان کە خۆی کردوونیەتە کلیشە وە ئەو وینانەی بۆ ڕوونکردنەوەن وەك نەخشەو وینەی شیوەی: فەرەیدون، کاوە، جەمشیدی جم، و سورەتی حوکمداریکی کوردانە، لاپەرەیەك لە کتیبی ئاویستاو مەنزەرەیەکی ئاتەشکودەیەك لە ئازەربایجان و سەمەردیس؛ جگە لە چەن دیمەنی تر و کلیشە کە لە کۆتایی بابەتەکانیدا دایناون، هەموو ئەمانە بایەخی ئەو پیاوە دەردەخەن بۆ هونەری دەرهینانی چاپەمەنی.

حسین حوزنی زۆر پشتی بە گواستنەوەی وینەو دیمەنەکان بەستوە، گەلیکیانی لە سەرچاوەی ترەوە وەرگرتوەو هەندێ وینەشی بە کۆکردنەوەی وینیەك یان چەند بەشیکی جیاجیا دروست کردوە. وەك تاریخ کردستان کە لە کۆمەلیك وینەی پاشماوەی جیاوازو سەردەم و سەرچاوەی جیاوازەوە هیناوە لەگەڵ نووسینی نەخشەو دیمەنی سروشتدا تیکەلێ کردوە.

کتیبی وینەگەری و کۆلین جگە لەو لایەنە هونەریانەی زۆر سەرپییی ئاماژەم پیدا هەر بۆ خۆی لیکۆلینەوەی زانستی تایبەت بە ئاوردانەوەی سەردەمیکمان بۆ بواری کیمیاو فیزیا، هەلدەگریت و دەزانین کتیبخانەی کوردیش لەم لایەنەوە چەند هەژارە.



* گرافیك– Graphic وشەیەکی گریکیە بە مانای نیگار و ڕەنگکاری یان نووسین و کۆلین و نووسین، و سیمبولە دەلالەتیەکان.. هتد دیت. یان تایبەتمەندە بە کۆلینی سەر کانزا یان بەرد یان تەختەی چاپ پەیوەست بە هونەری چاپەمەنیەوە.. و گەلیك پیناسەی تریشی هەیە.





**ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار**




(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / ٣١٢٠٦٩٠

لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008

E-mail.

www.sardam-or\web mail



چاپخانەی (ڕەنج)


**مەریوان جەلال**
**لەچەند دێڕێکدا:**

–١٩٦٦ لە سلێمانی لەدایك بووە.

–١٩٨٩ بەشی شێوەکاری پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی تەواوکردووە.

–چەندین پێشەنگەی تایبەتی کردۆتەوە. لەوانە:

(١٩٩٥ گەلەری سلێمانی، ٢٠٠٠ هۆڵی سلێمانی، ٢٠٠١ هۆڵی سلێمانی) هەروەها بەشداری زیاتر لە (٥٠) پێشانگەی هاوبەشی کردووە لەوانە:

(١٩٨٦–١٩٨٧ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی/ ١٩٩٢ پۆستەری منداڵان هۆڵی ڕۆشنبیری/ ئەمریکا ، سوید، هتد)